# هەڵەی پزیشک



# و



# بەرپرسیارێتی یاسایی



نووسینی

مافپەروەر

**کەمال حەسەن مەجید**

2018

**له بڵاوكراوەكانی كتێبخانەی یادگار له سلێمانی**

**سلێمانی : شەقامی پیرەمێرد ژ.م (:٠٧٧٠١٥٤٢٩٧٨ – ٠٧٥٠١٥٤٢٩٧٨)**

==================================================

- ناوی كتێب: **هەڵەی پزیشك و بەرپرسیارێتی یاسایی**
- نووسینی : **كمال حسن مجید**
- چاپ: **چاپی یەكەم**
- ساڵ: ٢٠١٨
- ژمارەی سپاردن: **له بەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانە گشتییەكان ژمارە سپاردنی (١٣٥٤) ساڵی ٢٠١٨ ی پێدراوە**
- چاپخانە:



كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ

(سورة المدثر/١٧)

**هەموو کەسێک بارمتەی کردارەکانی خۆیەتی**

# سوپاس‌و پێزانین

وەک ئەمەکو لە بەرچاوبوون، پڕ بە دل سوپاس‌و پێزانینی خۆم ئاراستەی زۆر بەڕێز ( **دادوەر إسماعیل عمر احمد** ) دەکەم کە هاوکاری کردم بە پێداچوونەوەی ئەم پەرتوکەو, سەرنج‌و تێبینیەکانی جێگای بایەخ‌و, یارمەتیدەر بوون, **تا** ئەم بەرهەمە بەم شێوە بێتە بوون.

**نوسەر**

# پێشکەش

ئەم بەرهەمە پێشکەش دەکەم بە منداڵە ئازیزەکانم:

مامۆستا راشد

دکتۆر رێبازو دکتۆرە سازگاری هاوسەری

رۆژگار پسپۆڕی کیمیایی

دیدار ئەندازیاری تەلارسازی

روبار کچی بچوکو هێژام ...

پێشکەش بە هەموو پزیشکێکی دڵسۆز ...

بە هەموو نەخۆشێک بە هەڵەی پزیشکی زیانی بەرکەوتبێت...

# پێشکەشکردن

ڕۆژانە لە هەموو کونجێکی ئەم جیهانەدا بە هەزاران کەس بە هۆی پێشکەوتنی زانستی پزیشکی و هەوڵ و ماندوبوونی پزیشکە بەڕێزەکان ژیانیان لە مردن ڕزگار دەکرێت و، ئومێد بۆ خۆیان و، خانەوادەکانیان دەگەڕێتەوە، ئەمەش وادەکات مرۆڤایەتی لە دێر زەمانەوە قەرزاری زانستی پزیشکی و پزیشکەکان بێت کە مایەی ستایش کردنیانە. بەڵام بێگومان لە لایەکی ترەوە ڕۆژانە سەدان کەسیش بە هۆی هەڵەی پزیشکی و کەمتەرخەمی هەندێك لە پزیشکان دوچاری ئازارو پەککەوتەیی دەبن، تەنانەت هەندێجار دەگاتە ئاستی مردن. بەڕێز (کاك کمال حسن مجید) لەم نوسینەیدا هەوڵی تەواوی داوەو توانیویەتی بە تێرو تەسەلی باسی هەڵەی پزیشکی و بەرپرسیارێتی یاسایی بکات و، لە باسەکەشیدا پشتی بەستووە بە چەندین سەرچاوەی گرنگی زانستی و یاسایی کە هێزی زیاتریان بە نووسینەکەی بەخشیوەو، توانیویەتی شیکردنەوەیەکی باش بۆ بابەتەکە بکات و جۆرەکانی هەڵەی پزیشکی دیاریکردووە لەگەڵ بەرپرسیارێتی لە ئەنجامدانی هەڵەی پزیشکیدا، گومانی تیادا نیە کە نوسین لەسەر ئەم بابەتانە بە کوردی کەمەو، لە داهاتوودا وەکو سەرچاوەیەك بە تایبەتی بۆ خوێندکارانی زانکۆ لە کاتی توێژینەوەدا سوودی لێوەربگیرێت، بە تایبەتی ئەم بابەتە لە بابەتە گرنگەکانەو، ڕۆژانە ئەم جۆرە کەیسانە دووبارە دەبنەوە، بەشێوەیەکی تایبەتی تر بۆ دیاریکردنی ئەو کەیسانە کە ئایا ئەو دەرئەنجامەی کەوتۆتەوە لەو کردارەی پزیشك کردویەتی و بوەتە مایەی زیانگەیاندن بە نەخۆش، یان پەککەوتەی کردووە، یان مردووە، ئایا ئەو ئەنجامە ئەنجامێکی چاوەڕوانکراوە؟ ئایا ئەگەر هەر پزیشکێکی ئاسایی ئەو کارەی بکردایە هەمان ئەنجامی لێدەکەوتەوە؟ ئایا ئەو پزیشکە گرنگی بە کارەکەی و بە نەخۆشەکەی داوە؟ وەکو گرنگیدانی پزیشکێکی ئاسایی؟ لێرەوەو لە دەرئەنجامی وەڵامی زانستیانەی ئەم پرسیارانە بەرپرسیارێتی پزیشکەکە دەردەکەوێت. دادگاکان بۆ دەستنیشانکردنی ئەو بەرپرسیارێتیە پەنا بۆ شارەزا دەبەن کە پسپۆڕو کارامە بێت لەو بوارەدا، گومانی تیادا نیە شارەزاکانی بواری پزیشکی هەر پزیشکەکان خۆیانن، لێرەوە کێشەکان قوڵتر دەبنەوە، چونکە بەداخەوە زۆرجار ئەو پزیشکانەی وەکو شارەزا ڕایان وەردەگیرێت لە دادگاکان، یان لە لیژنە پزیشکیەکان لە کاتی نوسینی ڕاپۆرتی پزیشکیدا هەستی هاوپیشەیی بەسەر ڕاپۆرتەکانیاندا زاڵە، ئەمەش کاری دادگاکان گرانتر دەکات.

لە كۆتايدا بە هيواين ئەم نوسينەی بەڕێز (كمال حسن) ببێتە مايەی كەمبونەوەی هەڵەی پزيشكی لە هەرێمەكەمانو ئاشنابوونی پزيشكە بەڕێزەكان بەو بەرپرسيارێتيە ياساييە لەسەر شانيانە لە كاتی ئەنجامدانی كارەكانيان كە كاری جوانو مرۆڤدۆستانەيەو، زاڵبوونی هەستی پيشەيی بوون بەسەر هاوسۆزی پيشەگەريدا.

دواجار هيوای سەركەوتن بۆ (كاك كمال) دەخوازمو بە هيوام بەردەوامبێت لەسەر ئەو ڕێچكەيەی گرتوويەتیو، نوسينی زياتری بكەوێتە بەر ديدەی خوێنەران.

**دادوەر**

**اسماعيل عمر احمد**

**٢٠١٧/١٢//٢٢**

# پێشەکی

پیشەی پزیشکیی پیشەیەکی مرۆڤانەو مۆراڵیو زانستی پیرۆزو گرنگە، چونکە پەیوەندی بە ژیانو جەستەی مرۆڤەوە هەیە، ئەوەش دەخوازێت پزیشك گرنگیەکی تەواو بە نەخۆشەکانی بدات، چەندی لە توانادایە بە تەنگی نەخۆشەوە بێتو، بەپێی ڕێنمایەکان ڕەفتارو هەڵسوکەوت بکات، ئەگینا بەرپرسیارێتی دەکەوێتە ئەستۆو، لێپێچینەوەی لەگەڵدا دەکرێت، هەرچەند پیشەی پزیشکی لە بناغەدا پیشەیەکی مرۆڤانەیە بەڵام پیشەیەکی مەترسیداریشە، چونکە هەر هەڵەیەك ڕوبدات ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە ژیانی مرۆڤەوە هەیە، هەرچەند پێشکەوتنێکی گەورە لە بواری پزیشکیدا ڕویداوە، بەڵام لە بەرامبەریشدا بە هۆی زۆربونی کاری پزیشکیو، بەکارهێنانی ئامێرە پزیشکیەکان لە پشکنینو، دەستنیشان کردنو چارەسەرکردنی نەخۆشیدا، مەترسی بۆ سەر نەخۆش دروست دەبێت، لەو مەترسیانەش هەڵەی پزیشکە، هەر هەڵەیەکی پزیشك زیان بە نەخۆش بگەیەنێت پزیشكو ستافەکەشی دەخاتە بەردەم بەرپرسیاریەوە، گرفتەکە لەوەدایە پزیشك نەزانێت چ کارێك هەڵەیەو، چ ڕەفتارێك بەرپرسیارێتی دروست دەکاتو، یاساو ڕێنمایەکان ڕێگایان بە چی داوەو، چیشیان قەدەغە کردوە. لەولایشەوە نەخۆش وادەزانێت بە ڕۆشتنی بۆ نەخۆشخانە دەبێت چاك ببێتەوە، ڕاگەیاندنەکانیش کە دەبێت ڕۆڵی ئەرێنیان هەبێتو، خەڵکی شارەزای بوارەکە قسەی تێدا بکات، بە پێچەوانەوە ڕۆڵی نەرێنیان هەیە، ئەو هەموو خزمەتەی پزیشك پێشکەشی هاوڵاتیانی دەکات لەبری نرخاندن، وادەزانن هەموو مردنێك لە نەخۆشخانەدا ڕودەدات پزیشك هۆیەکەیەتی! بۆیە هەوڵمدا وەك بەجێهێنانی ئەرکێك ئەم بابەتە ( هەڵەی پزیشکییو بەرپرسیارێتی یاسایی) بخەمە بەردەست پزیشکانو یاساناسان، تابزانرێت مافی نەخۆش چی یەو، ئەرکی پزیشك کامەیەو، لە چیدا بەرپرسیارەو، لە چیدا بەرپرسیار نییەو، کام کارەیە ئەرکی پزیشك تیایدا تەنیا بە تەنگەوە هاتنو توانا بەخەرجدانەو، کام کارەیە دەبێت بەئەنجام بگاتو، نابێت هەڵەی تێدا بکرێت، بە هیوای ئەوەی توانیبێتم ئەرکێکی سەرشانم ئەنجام دابێتو، سودێکیشم بە یاساناسانو، پزیشکانو، ڕۆشنبیرانو کتێبخانەی کوردی گەیاندبێت....خوای دلۆڤان پشتیوانی هەمووان بێت.

کمال شێخ حسن

سلێمانی ٢٠١٧/٧/٢٤

# باسی یەکەم

# پایەکانی هەڵەی پزیشکی

**دەستپێك: بەرپرسیارێتی درێخی کردن:**

مرۆڤ لە ژیانیدا بۆ تێرکردنی پێویستیو حەزەکانی چەندین جۆر کارو چالاکی ئەنجامدەدات، لەوانەیە لەو چالاکیانەوە، یان بە هۆی ئەو چالاکیانەوە زیان بە کەسانی دیکە بگەیەنێت، یان بە هۆی ئەوانەی لە ژێر چاودێری ئەودان، یان ئەو شتانەی لە ژێر ڕکێفو دەستەڵاتی ئەودان زیان بە خەڵك بگەیەنرێ، یان لەوانەیە لە نەکردنی کارێك یاسا سەپاندویەتی زیان بە کەسانی دیکە بگات. لێرەدا یاسا دێتە ناوەوە بۆ لێپرسینەوەو سزادانی ئەو کەسەی زیانی بە کەسانی تر گەیاندوە، بەم شێوە سزایە دەوترێ بەرپرسیارێتی.

بەرپرسیارێتی لە ڕواڵەتدا جۆراوجۆرنو، لە سروشتیشدا جیاوازن. ئەو سزایەی یاسای سزادان بیسەپێنێ پێی دەوترێ: **بەرپرسیارێتی تاوانکاری (سزایی)**، بەڵام ئەو بەرپرسیارێتیەی یاسای شارستانی بڕیاری لەسەر دەدا پێی دەوترێ: **بەرپرسیارێتی شارستانی.**

بەرپرسیارێتی شارستانیش دەکرێت بە دوو بەشەوە:

یەکەمیان بەرپرسیارێتی گرێبەستی (التعاقدی): بریتی یە لە سەرپێچی کردنی پابەندبونێك لە گرێبەستێکی دروست (صحیح) پەیدا بوبێت.

دووەمیان بەرپرسیارێتی درێخی کردن (التقصیری): سەرپێچی کردنی پابەندبوونێکە یاسا سەپاندویەتی، پێیشی دەوترێ بەرپرسیارێتی کاری نارەوا.

یان دەڵێین بەرپرسیارێتی درێخی کردن پابەندبونی کەسێکە بە قەرەبوکردنەوەی ئەو زیانەی لە کەسێك کەوتووە لە کردارێکی زیانبەرەکە خۆیەوە یان ئەوانەی لە ژێر کۆنترۆڵی ئەودان یان پەیرەوکارن (تابع)، یان هەرشتێکی دیکە لە ژێر کۆنترۆڵی ڕاستەقینەی ئەودان، لەو سنورەی یاسا دیاری کردوە. ماددەی (١/٢١٩) یاسای

شارستانی عێراقی دەڵێ: ( میری و شارەوانیەکان و دەزگاکانی دیکە خزمەتگوزاری پێشکەش دەکەن و، هەموو کەسێك دەزگایەکی پیشەسازی یان بازرگانی هەڵدەسوڕێنێ بەرپرسیارن لەو زیانەی خزمەتگوزارەکانیان دروستی دەکەن، ئەگەر زیانەکە لە کاتی کارکردنیاندا بە سنور بەزاندن دروست بوبێت).

## جیاوازی نێوان بەرپرسیارێتی درێخی کردن و گرێبەستی لەبواری هەڵەی پزیشکیدا:

**ئەمانەی خوارەوە کورتەی جیاوازیەکانن:**

١ – لە لایەنی سەرچاوەوە: پابەندبون لە بەرپرسیارێتی گرێبەستیدا سەرچاوەکەی گرێبەستە، بەڵام پابەندبون لە بەرپرسیارێتی درێخی کردندا سەرچاوەکەی یاسایە.

٢ – لە لایەنی شیاویەوە (الاهلیه): بۆ جێبەجێ بوونی بەرپرسیارێتی لە گرێبەستدا مەرجە کەسەکە پێگەشتو بێت و (راشد) شیاوی یاسایی هەبێت، بەڵام لە بەرپرسیارێتی درێخی کردندا ئەوە مەرج نییە.

٣ – لە لایەنی ئاگادارکردنەوە: داواکردنی قەرەبوکردنەوە لە هەڵەی پزیشکیدا بەپێی بەرپرسیارێتی گرێبەستی دەبێت ئاگاداری پزیشك یان دەزگا تەندروستیەکە بکرێت بە قەرەبوکردنەوەی ئەو زیانەی لە ئەنجامی پێشێل کردنی مەرجەکانی گرێبەستەکە کەوتوەتەوە. بەڵام لە بەرپرسیارێتی درێخی کردندا ئاگادارکردنەوە پێویست نییە.

٤ – لە لایەنی سەلماندنەوە: لە بازنەی بەرپرسیارێتی گرێبەستیدا ئەرکی سەلماندن خراوەتە ئەستۆی قەرزدەر (دائن)، ئەمە ئاسانترە لە سەلماندن لە بەرپرسیارێتی درێخی کردندا کە خراوەتە ئەستۆی نەخۆشی زیان لێکەوتوو، چونکە لە بەرپرسیارێتی گرێبەستیدا قەرزدەر ئەوەندەی لە ئەستۆیە بیسەلمێنێ قەرزار پابەندبونە گرێبەستیەکەی جێبەجێ نەکردووە، بەڵام لە بەرپرسیارێتی درێخی کردندا دەبێت نەخۆش بیسەلمێنێ پزیشك بە پێشێلکردنی ئەرکێکی یاسایی هەڵەی کردوە و، بەو هۆیەوە زیانی پێگەشتووە.

٥ – له لایەنی پێکەوە هاوکاری (تضامن) له نێوان دوو بەرپرسیارێتیەکەدا: له بەرپرسیارێتی درێخی کردندا ئەگەر بەرپرسیارەکان فرەبوون بە هاوکاری قەرەبوەکە دەبژێرن، چونکە بە دەقی یاسا هاوکاری کردن له نێوانیاندا دیاری کراوە، بەڵام له بەرپرسیارێتی گرێبەستیدا یاسا پێکەوە هاوکاری نەسەپاندووە.

٦ – له لایەنی رێکەوتن لەسەر بەخشین (لێبوردن) له بەرپرسیارێتی: له بەرپرسیارێتی درێخی کردندا بەخشین له بەرپرسیارێتی دروست نییە، چونکە بەرپرسیارێتی درێخی کردن ( نظام عام)ەو، هەموو رێکەوتنێك لەوبارەوە پوچ و بەتاڵە، بەڵام دەکرێت ئەرکەکەی تێدا سوك بکرێت. بەڵام له بەرپرسیارێتی گرێبەستیدا رێکەوتن لەسەر بەخشین دروستە مەگەر قەرزار گزیو خەڵەتاندن یان هەڵەیەکی گەورەی کردبێت.

٧ – له لایەنی ماوە بەسەرچوون: بەرپرسیارێتی گرێبەستی بە تێپەربوونی (١٥) ساڵ داوای مافەکە نەکرا، ئیتر داواکەیان نابیسرێ. بەڵام له بەرپرسیارێتی درێخی کردندا له رۆژی پێزانینەوە بە تێپەربوونی (٣) ساڵ داوای مافەکە نەکرا، دواتر ناتوانرێت داوای بکرێت، واتە: ئەگەر داوایشی بکات دادگا وەڵامی ناداتەوە.

٨ – له لایەنی دەسەڵاتی شوێنی دادگا: له بەرپرسیارێتی گرێبەستیدا دادگای تایبەتمەندو دەسەڵاتدار شوێنی پزیشكو نەخۆشە، هەندێك جاریش شوێنی گرێبەستەکەو نەخۆشخانەکە یان هەر شوێنێکە هەردوولا لەسەری رێکدەکەون، بەڵام له بەرپرسیارێتی درێخی کردندا دادگای تایبەتمەندو خاوەن دەسەڵات ئەوەیە له سنورەکەیدا ( له قەڵەمرەودا) هەڵە پزیشکیەکە روودەدات.

٩ – له لایەنی چاودێری دادگای پێداچونەوە: له بەرپرسیارێتی گرێبەستیدا دادگای پێداچونەوە چاودێری ناکات، بە بەڵگەی ئەوەی شتەکە پەیوەندی بە بوونی گرێبەستێکی نوسراوەوە هەیە، لێکدانەوەی تایبەتە بە دادوەری بابەتەکەو. پێویست بە چاودێری دادگای پێداچونەوە ناکات، بەڵام له بەرپرسیارێتی درێخی کردندا پێشێل کردنی پابەندبونێکی یاسایی یەو، دادگای پێداچونەوە چاودێری ئیجتهادی دادوەر دەکات له بڕیارداند. [1].

پایەکانی بەرپرسیارێتی درێخی کردن بریتین له هەڵەو زیانو پەیوەندی هۆیەتی نێوانیان، له خوارەوە بە درێژی لەسەریان دەدوێین:

# لقی یەكەم

# هەڵە كردن

## یەكەم: هەڵە چی یە؟:

هەڵە بە شێوەیەكی گشتی سەرپێچی كردنی یاساو سیستەمو ڕێنمایی‌و بڕیارەكانە، ئەوەش نەكردنی كارێكە پێویستە بكرێ، یان كردنی قەدەغەكراوێكە كردنی یاساغە، هەڵە كاتێك ڕودەدات تاوانبار ڕەفتارێك بكات، پێچەوانەی ئەو ڕەفتارە بێت یاسادانەر لە یاساو سیستەمو ڕێنمایی‌و بڕیارەكاندا بۆ مەبەستی پاراستنی گیانی خەڵك‌و كەمكردنەوەی ڕودانی ئەو كارە مەترسیدارانەیە كە زیان بە كەسانی دیكە بگەیەنێت سەپاندویەتی.[٢]. بە شێوەیەكی گشتی هەڵە وا پێناسە دەكرێت، لادانێكی ئەرێنی یاخود نەرێنی ڕەفتاری قەرزارە. – قەرزار ئەو كەسەیە پابەندە بە ئەنجامدانی كارێك–، بەو پێیەی هەڵە بە گشتی بناغەی بەرپرسیارێتی شارستانیە، ئەگەرچی ئاسان نییە چەمكی هەڵە بە گشتی دیاری بكرێت، بەڵام دەبێت بزانین دیاریكردنی هەڵە زۆر گرنگە، تا بتوانین لە ڕێگایەوە چارەسەری ئارێشەی بەرپرسیارێتی بكەین كە لەسەر بناغەی هەڵە بنیات نراوە. یاسادانەر (مشرع) پێناسەی هەڵەی نەكردوە، بەڵكو ئەو پرسەی بۆ فەقیهەكان بەجێ‌هێشتووە، لایەنی باشی ئەو پێناسە نەكردنەش لەوەدایە، بەرپرسیارێتیان لە چوارچێوەیەك‌و چەند دەستەواژەیەكی دیاریكراودا قەتیس نەكردوە، ئەمەش دەستەبەری پاراستنی زیاتری زیانلێكەوتووان دەكات، فەقیهەكان لە پێناسەكردنی هەڵەدا، كە پایەیەكی بەرپرسیارێتی درێخی كردن یان گرێبەستی یە جیاوازن، ئەگەرچی لەسەر پێناسەیەكی دیاریكراوی هەڵە یەكدەنگ نەبوون، بەڵام هەموو پێناسەكان لە یەكترەوە نزیكن، لێرەدا هەوڵ دەدەین پێناسە جۆراوجۆرو جیاوازەكان بخەینە ڕوو.[٣].

## ١ - پێناسەی هەڵە:

أ : **هەڵە لە زماندا واتە: پێچەوانەی ڕاستیی، لە ڕێلادان، ناڕاست، نەپێکان، تاوانو گوناه.** [٤].

**ب : هەڵە لە زاراوەدا: بەم شێوانە پێناسە کراوە**

١ - ئیبنو ڕەجەبی حەنبەلی دەڵێ: ( هەڵە ئەوەیە: مرۆڤ دەیەوێ کارێك بکات، کەچی کارەکەی ڕێکەوتی شتێکی تر دەکات کە مەبەستی ئەو نییە). [٥].

٢ - پلانیۆل دەڵێ: ﴿ هەڵە سەرپێچی کردنە لە پابەندبوونێکی پێشوتر ﴾. [٦].

ئەو پابەندبوونە پێشوترە پابەندبوونی یاساییە بە پاراستنی مافی هەمووانو، زیان نەگەیاندن پێیان. پابەندبوونە بە چاودێریی کردن، چاودێریکردنی داواکراویش وریاییو بە ئاگابوونە لە ڕەفتاردا بۆ زیان نەگەیاندن بە کەسانی دیکە. سەرپێچی کردن لە پابەندبوونی گرێبەستی دەبێتە هۆی بەرپرسیارێتی گرێبەستی (المسؤلية العقدية)، بەڵام سەرپێچی کردنی پابەندبوونی یاسایی بەرپرسیارێتی درێغیکردن (المسؤلية التقصيرية) دروست دەکات، چونکە پابەندبوونی یاسایی پابەندبوونە بە درێغی نەکردن لە چاودێری کردندا.

٣ - ساڤاتیە دەڵێ: ﴿ هەڵە سەرپێچی کردنە لە ئەرکێکدا، هەرکات ئەنجامەکەی ئاشکرابوو، هەڵەکار بزانێت ئەرکێکی پێشێل کردووە ﴾. [٧].

٤ - مازۆ دەڵێ: ﴿ هەڵە درێخی کردنی مرۆڤە لە هەڵسوکەوتو ڕەفتاریدا، بە شێوەیەك لە کەسێکی وریاو هۆشیار نەوەشێتەوە، ئەگەر لە هەمان بارودۆخی هەڵەکاردا بێت ﴾. [٨].

٥ - د.محمد علي عمران دەڵێ: ﴿ هەڵە دەرچونە لە پابەندبوون، یان ئەرکێکی یاسایی پێشوتر، یان لادانە لە ڕەفتاری ئاسایی کەسێکی ڕاهاتوو﴾. [٩].

**دووەم: جۆرەکانی هەڵەی پزیشکیی:**

**١ - هەڵەی ئاسایی:**

**ئەو جۆرە هەڵەیە پەیوەندی بە بنەمای هونەریو پیشەییەوە نییە. واتە هەڵەکە لە دەرەوەی چوارچێوەی پیشەو بنەچەی هونەریەوەیە، بەڵکو لە ڕەفتاری مرۆڤەوە دروست دەبێت، لە ئەنجامی پێشێل کردنی ڕێسا گشتیەکانی پابەندبونەوە ڕودەدات، کە پێویستە هەموو کەس پێوەی پابەند بێت، واتە: لێرەدا پزیشک وەك مرۆڤێك هەڵە دەکات، نەك وەکو پزیشکێك بەرامبەر نەخۆشێك بیکات ... لەم بارەدا وەك هەموو کەسێکی ئاسایی دیکە مامەڵە لەگەڵ پزیشکدا دەکرێتو، پێوەری لادانیشی وەك پێوەری کەسێکی ئاساییە. (١٠). هەڵەی ئاسایی ئەو هەڵەیە دەگەڕێتەوە بۆ پێشێلکردنی ڕێسای وریاییو خۆپارێزیی (الحیطة والحذر) کە دەبێت هەموو خەڵك پێوەی پابەندبن، لە نێوانیشیاندا پیشەوەرانی وەك پزیشكو پارێزەرو ئەندازیار دەگرێتەوە. [١١].**

**نموونەی هەڵەی ئاسایی:**

- **نەشتەرگەری کردن لە کاتی سەرخۆشیداو، لە کاتی نەخۆشی وەك دەست لەرزین.**
- **لەبیرچونی پارچە شاشو ئامێری نەشتەرگەری لە جەستەی نەخۆشدا.**
- **دەستدرێژی کردنە سەر نەخۆش بە لێدانو جنێوو، سووکایەتی پێکردن.**
- **کەمتەرخەمی کردن لە بەنجکردنی نەخۆشدا.**

**فیقهو دادوەریی لەسەر ئەوە جێگیر بوون هەڵە ئەگەرچی ئاسایش بێت دەتوانرێت لێپرسینەوە لە پزیشك بکرێت.**

**دادوەریی عێراقی سەیری ئەو هەڵە ئاساییانەی پزیشکی کرد، وەك لەبیرچوونی پارچەیەك شاش لە سکی نەخۆشدا کە بوو بە هۆی هەوکردنو تەنینەوەی هەوکردنەکە، بڕیاری بەرپرسیارێتی پزیشکەکەیداو. دادگای پێداچونەوەی عێراقی بە خستنە پاڵی هەڵەکە بۆ پەرستارەکە، یان یاریدەدەرەکەی لە پزیشکەکە نەبورا، دادگای پێداچوونەوەی عێراقی ژمارەی دۆسیە ٨٢ /موسعە اولی/ ٩٨ لە بەرواری ٩-١١-١٩٩٨ بڕیاریدا (ئەم دادگایە وادەبینێت هەر وەك دادگای بابەتەکە بۆی چووە، داوا لەسەرکراو**

(پزیشکەکە) بە هۆی کەمتەرخەمییەوە لە بەدواداچوون و سەرپەرشتیکردن لە دڵنیابوون لە نەمانەوەی پارچە شاش لە شوێنی نەشتەرگەریەکەدا، لە ئەنجامی هەڵەی هاوکارەکانیدا بوو بەهۆی زیان گەیاندن بە داواکار (نەخۆشەکە)، وتنی پێچەوانەی ئەوەو بەرپرسیارێتی هەڵەکە بخرێتە سەر یاریدەدەری پزیشکەکە یان یەکێکیان، پێچەوانەی ژیری و لۆجیک و، داخوازیەکانی سروشتی پیشەی پزیشکە، کە سورە (حریص) لەسەر پاراستنی ژیانی ئەو نەخۆشەی متمانەی خۆی بەو پزیشکە داوە. [١٢].

## ٢ - هەڵەی هونەریی:

گەورە زانای یاسایی عبدالرزاق السنهوری دەڵێ: پابەندبوون لە مومارەسە کردنی پیشەدا توانا بەخەرجدانێکی هونەری دیاریکراوە، وەك چۆن بنەما پیشەیەکان لە خاوەن پیشەی دەخوازێت، پابەندبوونیان بە گرێبەستەوە پابەندبونە بە خەرجدانی توانا، نەك بە ئەنجام گەیاندن، بۆ ئەوانەی ئەو پیشە هونەریە (پزیشکی) ئەنجام دەدەن پێوەری بەرپرسیارێتی گرێبەستی و، پێوەری بەرپرسیارێتی درێخی کردن یەکدەگرنەوەو، لە بەرپرسیارێتی درێخی کردندا دەبن و، داوایان لێ دەکرێت وەك بنەمای هونەری پیشەکە دەیخوازێت توانای هونەری بەخەرج بدەن، ئەمە ئەو ڕەفتارە هونەریە باوەیە لە کەسێك داوا دەکرێ توانا و زانستێکی مامناوەندی هەبێت، هەرلادانێك لەو پێوەرە ئەگەرچی بەرپرسیارێتی گرێبەستی یان درێخی کردن بێت، بەهەڵەی پیشەیی دادەنرێت. [١٣].

هەڵەی هونەری ئەو هەڵەیە تایبەتە بە کاری هونەریەوە، کە دەرچونە لەو ڕێسا زانستی و بنەما هونەریانە کە کۆنترۆڵی (تحکم) پیشەی پزیشکی و ڕاستیە جێگیرەکان دەکەن و، سەرپێچی کردنی بەڵگەنەویستە زانستیە سەلمێنراوەکانە. [١٤].

مەبەست لە هەڵەی پیشەیی ئەوەیە پیشەوەران پێشێلی ئەو ئەرکانە دەکەن کە پیشەکانیان بەسەریاندا دەسەپێنێ. وەك نەشتەرگەر گوێنەداتە بنەماکانی نەشتەرگەری، یان پارێزەر کەمتەرخەمی بکات لە بنەماکانی داکۆکی کردن لە بریکارگرتەکەی. [١٥].

هەڵەی پیشەیی پزیشك کاتێك دروست دەبێت پزیشك سەرپێچی ئەو بنەچەو ڕێسایانە بکات کە پیشەی پزیشکی دەیسەپێنێ. نموونەی هەڵەی هونەری: هەڵەکردن لە دەستنیشان کردنی نەخۆشیداو، لە چارەسەر کردنداو، لە سڕکردن و، لە نەشتەرگەریدا. [١٦].

**سێیەم: لەسەر چ هەڵەیەك لێپرسینەوە لە پزیشك دەكرێت؟**

زانایان لەسەر ئەوە ڕێكن پزیشك هەر هەڵەیەكی ماددی بكات چ لە چوارچێوەی كارەكەیدا بێت، یان لە دەرەوەی كارەكەیدا بێت، وەك كەسێكی ئاسایی لێپرسینەوەی لێ دەكرێت، بەڵام لە هەڵەی پیشەییدا زانایان جیاوازن لە لێپرسینەوەی پزیشك، هەندێك لە زانایان بۆچونیان وابوو لە هەڵەی هونەریدا لێپرسینەوە لە پزیشك نەكرێت... بەلاّم لە فیقهی هاوچەرخدا ئەو بۆچوونە وەرگیراوە ئەگەر پزیشك لە كاتی كاركردنیدا هەر هەڵەیەكی كرد لێپرسینەوەی لێبكرێت، ئیتر ئەو هەڵە چ هەڵەی ئاسایی بێت، یان هەڵەی پیشەیی بێت.

دادوەریی عێراقی لە بڕیاری دۆسیەی ژمارە ١٢٣٦/ م گواستراوە/ ٢٠٠٢/ لە ٨/٢٨/ ٢٠٠٢ ئاماژەی بەوە كردوە لە هەڵەی پزیشكیداجیاوازی ناكات لە نێوان، ( هەڵەی ماددیو هەڵەی پیشەیی)، لە هەردوو بارەكەدا پزیشكی بەرپرسیار كردوە، چونكە لە هەردوو بارەكەدا هەڵەكان یەكنو، لەهەمان كاتدا دادوەر لەسەر ڕوداوێكی جێگیر بڕیار دەردەكات، نەك لەسەر گومان ( ... كرداری پێداچونەوە لەسەركراو (مميزعليه) بەرپرسیارێتی درێخی كردنە لە كەمتەرخەمی كردنی لە بەدواداچونو، سەرپەرشتی كردن لە دڵنیابوونی لە چۆڵكردنی شوێنی نەشتەرگەریەكە لە پارچە شاشە بەكارهاتووەكان پێش ئەوەی فەرمان بدات بە هاوكارەكانی شوێنی نەشتەرگەریەكە بدورنەوە. لە هەمان كاتدا بۆ ڕێگری لە ڕونەدانی زیان وریایی پێویستی بەكار نەهێناوە وەك ئەوەی سروشتی پیشەی پزیشك دەیخوازێت، وەك خەمخواردنو بەتەنگەوەهاتنی نەخۆش كە متمانەی دارایی خۆی پێ بەخشیوە، هەروەها سوربوون لەسەر سوكایەتی نەكردن بە ناوبانگی پیشەكەیو، ئەو توانایەی پرۆسەی نەشتەرگەری دەیخوازێت بە چاوپۆشی كردن لەوەی ئەو هەڵە ڕویداوە چەندە گەورەیە ... ).

دادگای پێداچوونەوەی هەرێمی كوردستانیش نموونەی هەڵەی هونەری دیاری كردووە، بڕیاری پێداچوونەوەی ژمارە ١٥٦ / دەستەی شارستانی /٢٠٠٢، لە بەرواری ٢٠٠٢/٦/١٢ (لە ڕوداوی داواكە و ڕاپۆرتی پسپۆڕانی پزیشكی ددان دەركەوت: هەردوو داوا لەسەر كراوان لە میانەی پرۆسەی نەشتەرگەریدا بۆ لادانی گلاندی لیكەڕژێن دەماری زمانی داواكارەكەیان بڕیوە، ئەمەش بە هەڵەیەكی هونەری دادەنرێت، چونكە هەوڵی پێویستیان نەداوە وەك چۆن پزیشكێكی ئاسایی دەجوڵێتەوە، تا ڕێبگرن لە زیان

گەیاندن بە نەخۆشەکەو، درێخییان کردوە لە توانا بە خەرجدانی پێویست، بۆیە زیان بە داواکار گەشتووە کە خۆی لە نەمانی هەستی تام کردن‌و، ئیفلیجبون لە دەماری زمان‌و، سستبونی قسە کردن‌و، لەنگبونی زمانی دەبینێتەوە، بۆ خەملاندنی بڕی قەرەبوو کردنەوە کە گونجاوبێت لەگەڵ ئەو زیانەی لە داواکار کەوتووە، پێویستبوو پشت بە بۆچوونی پسپۆڕ ببەسترێت [(١٧)].

## چوارەم: پێوەری خەملاندنی هەڵەی پزیشکی:

لەبەر ئەوەی پابەندبوونی پزیشک بەتەنگەوەهاتن‌و بە خەرجدانی تەواوی توانایەتی، هەر کات پزیشك لە جێبەجێ کردنی پابەند بوونەکەیدا تەواوی توانای خۆی بە خەرج نەدا ئەوا بۆ دروستبونی بەرپرسیارێتیش دەبێت بوونی هەڵە بسەلمێنرێت بە پێشێلکارو هەڵە دادەنرێت. بۆیە دەبێت بگەڕێین بزانین ئایا پزیشك لە ئەنجامدانی کارەکەیدا درێخی کردووە یان نەخێر. لەوانەیە پزیشك توانای خۆی بەکارنەهێنێت، یان ئەندازەیەکی دیاریکراو توانا بەکار بێنێ، بۆیە پێویستە بۆ پێوانی ڕەفتاری پزیشکیی پێوەرێك دیاریبکرێت، هەتا بزانرێت ئەندازەی پێویستی بایەخپێدانی چەندبێت‌و، ئەو ئەندازە چەندە ئەگەر بەکاری نەهێنا بە هەڵە دادەنرێت، بۆ گەڕان بە شوێن پێوەرێکی گشتیدا دوو ئاڕاستە دەرکەوت: ئاراستەی پێوەری کەسی (الشخصی)و، ئاڕاستەی پێوەری بابەتی (الموضوعي). [(١٨)].

### ١ – پێوەری کەسیی:

مەبەست لە پێوەری کەسیی یان خودیی سەرنجدانە لە خودی ئەو کەسەی کردارە زیان بەخشەکەی ئەنجامداوە، تا بزانرێت ئایا کردارەکەی دەستدرێژیە یان بە لادان بۆی دەژمێردرێت، بە پێی پێوەری کەسیی کەسێکی وریاو چالاك لەسەر کەمترین لادان لە ڕەفتاریدا لێپێچینەوەی لەگەڵدا دەکرێت، بەلأم ئەو کەسەی زۆر وریاو چاپوك و چالاك نیە لەسەر لادانێکی ئاشکراو دیار نەبێت لێپێچینەوەی لەگەڵدا ناکرێت. [(١٩)].

زانایان دوو ڕەخنە ئاراستەی ئەم پێوەرە دەکەن، یەکەمیان: ئەم پێوەرە دەمانگەیەنێتە ئەنجامێکی ناپەسەند، چونکە ئەگەر کەسێکی کەمتەرخەم زیان بدات لە بەرژەوەندی خەڵك لێپرسینەوەی لەگەڵدا ناکرێت، چونکە هەڵسوکەوتەکەی ئاسایی بووە، بەلأم

کەسێکی وریاو چالاک لەسەر بچوکترین لادانی لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێت، ئەگەر چی ئاستی ڕەفتاریشی دانەبەزیبێت بۆ ئاستی کەسێکی کەمتەرخەم.

دووەمیان: ئەم پێوەرە ناخوازێت مرۆڤ توانایەکی تەواو بەخەرج بدات، تا بڵند ببێتەوە بۆ ئاستێکی ئاسایی، لە هەمان کاتدا ئەو پاراستنە دابین ناکات کە پێوەری بابەتی دابینی دەکات. [20].

## ٢ - پێوەری بابەتی:

مەبەست لە پێوەری بابەتی لە خەمڵاندنی هەڵەی پزیشکیدا بەراورد کردنی ڕەفتاری پزیشکە بە ڕەفتاری پزیشکێکی ئاسایی مامناوەند لە هەمان ئاستدا بێت، پزیشکی ئاسایی ئەو پزیشکەیە زۆر بلیمەتو هەڵکەوتوو نییەو، زۆریش دەبەنگو کەمتەرخەم نییە، بەپێی پێوەری بابەتی دەبێت لە ڕەفتارو هەڵسوکەوتدا بارودۆخی دەرەکی پزیشك لەبەرچاو بگیرێ، - وەك ئەوەی نەخۆشەکە لە فرۆکەیەکدایەو پزیشك کەرەستەی پێویستی لە بەردەستدا نییە بۆ ئەنجامدانی کارەکەی-. [21].

پێوەری بابەتی یان پەتی (مجرد) لە کۆنترۆڵکردنی لادانەکە بە واتە: پێوانی لادانەکە بە ڕەفتاری کەسێکی ڕاهاتووی پەتی کە لە هەمان دۆخی دەرەکی بکەردا بژی بەبێ گوێدانە خودی ئەو کەسەی کردارە زیانبەخشەکەی کردوە. مەبەستیش لە کەسی ڕاهاتوو کەسێکە لە هەمان گروپی بکەر بێتو، لە هەمان بارودۆخی بکەردا بێتو، ڕەفتاری مامناوەند بێت، زۆر وریاو بلیمەت نەبێتو، زۆریش کەمتەرخەمو کەودەن نەبێت. [22].

پێوەری بابەتی بۆ پارێزگاری کردن لە مافی پزیشکو نەخۆشیش سودبەخشە، چونکە پێوەری هەڵسەنگاندن کەسێکی مامناوەندە لە زانستو خەمخواردنو بەدەمەوەچوندا، ئەمەش پارسەنگی هەردوولا ڕادەگرێتو دەپارێزێ.

## لقی دووەم

## زیان گەیاندن

### زیان بەگشتی و زیانی پزیشکی بە تایبەت:

زیانگەیاندن پایەیەکی سەرەکی دروستبونی بەرپرسیاریێتی شارستانی یە، زیانەکە هەرجۆرو هەرشێوازێك بێت و، بۆچونەکان لەسەر بناغەی دروستبونی بەرپرسیاریێتی شارستانی هەرچەندە بگۆڕێن، بیناکردنی لەسەر بیرۆکەی هەڵەکردن یان بیرۆکەی لە ئەستۆگرتنی بەرپرسیاریێتی یان بوون بە هۆی زیان گەیاندن، ئەوانە کاریگەریان نابێت لەسەر پێویستبونی بە مەرجدانانی زیان گەیاندن بۆ دروستبونی بەرپرسیاریێتی شارستانی، چونکە زیان گەیاندن یەکەم چەخماخەی بیرکردنەوەیە بۆ لێپرسینەوە لەو کەسەی بووەتە هۆی زیان گەیاندنەکە، ئەو لێپرسینەوە بەپێی بەرپرسیاریێتی درێخی کردن یان گرێبەستی بێت، زیان ئەو شتەیە بەرپرسیاریێتی شارستانی لە بەرپرسیاریێتی مۆراڵی (ئەخلاقی)و بەرپرسیاریێتی تاوانکاری جیادەکاتەوە، لە بەرپرسیاریێتی ئەخلاقیدا هەڵەو گوناه ئەنجامو ئاسەواری لێ بکەوێتەوە یان نەکەوێتەوە، لێپرسینەوەی لە بارەوە دەکرێت، بەڵام لە یاسای سزایدا بۆ دروستبونی بەرپرسیاریێتی تاوانکاری مەرجە بیرۆکە خراپەکە لە جیهانی دەرەوەدا بە شێوەی کردار بەرجەستە ببێت و دەرکەوێ، چونکە تاوان هەرکات ڕۆشتە بواری جێبەجێ کردنەوە دەبێتە هەڕەشە بۆسەر سیستەمی کۆمەڵایەتی، بەڵام یاسای شارستانی تەنیا زیان گەیاندن لە بەرچاو دەگرێت، چونکە پەیوەندی بە قەرەبوکردنەوە هەیە، ئەو داوایەی زیان لێکەوتو بەرزی دەکاتەوە داوایەکی تایبەتە، داوای قەرەبووی ئەو زیانە دەکات کە لێی کەوتووە، هەرکەس زیانی پێ نەگەشتبێ ناتوانێت داوای قەرەبوکردنەوە بکات، دادوەریی دادگای پێداچونەوە لە بڕیاری ژمارە ١٨٩٣/م٢/٢٠٠٥ لە ٢٠٠٦/١/٢٥ لەسەری ڕێککەوتووە، ئەمەش بەپێی ئەو ڕێسا بە ناوبانگەیە دەڵێ: ( بەبێ بوونی بەرژەوەندی داوای قەرەبوکردنەوە ناکرێت)، بەرژەوەندیش ئەو سودە پراکتیکیەیە بۆ بەرزکەرەوەی داوا دەگەڕێتەوە ئەگەر بڕیاری بۆ بدرێت. [٢٣].

## زیانی پزیشکی:

زیانی پزیشکی هەموو ئەو زیانانەیە کە لە ئەنجامی بەرکەوتن لە لاشەی کەسی نەخۆشدا ڕوویداوە، ئیتر ئەو زیانە بەر تەندروستی مرۆڤ یان بەر لاشەی بکەوێت، هەموو دەستدرێژیەك بۆ سەر مافی تەواوکاری جەستەیی زیانێکە لەدەستدانی (خسارە)ی دارایی لێ دەکەوێتەوە، خۆی لەو تێچونەدا دەبینێتەوە کە زیان لێکەوتوو بە هۆی ئەو بەرکەوتنەوە لە دەستی دەچێتو، لەدەستدانی ئەو پارەیە کە زیان لێکەوتوو پێش بەرکەوتنەکەی دەستی دەکەوت، یان خۆی لەو ئازارانەدا دەبینێتەوە کە نەخۆش پێوەی دەناڵێنێ، یان ئەو جوانیەی لەدەستی داوە، لە بەرکەوتنێدا دەکرێت هەموو ئەوانە بخەمڵێنرێن بە سامان، دەستدرێژی کردنە سەر ژیان گەورەترین زیان گەیاندنە، چونکە لەناوچونی ئەندامێكو دروستبونی برینو بەرکەوتنی جەستەو عەقڵ لەوانەیە توانای دەسهات (کسب)ی مرۆڤ لەکار بخات، سەرەڕای تێچونی خەرجی چارەسەر کردن کە دەبنە هۆی خەسارەت بۆ پێکراوەکە، زیانی پزیشکی خۆی لە ئاسەواری هەڵەکردنو کەمتەرخەمی پزیشکدا دەبینێتەوە، کە لە مومارەسە کردنی کاری پزشکیدا ڕەچاوی خەمخۆریو وریایی نەکردوە، چونکە لە بنەڕەتدا پابەندبونی پزیشك پابەندبونە بە هۆکارەوە واتە هەوڵدانی تەواو، نەك پابەندی بەئەنجام گەیاندن.

**یەکەم: زیان چی یە؟**

-زیان ئەو ئازارەیە بەر مافێك یان بە بەرژەوەندیەکی ڕەوای کەسێك دەکەوێت، زیان گەیاندن پایەیەکی بنەڕەتی بەرپرسیارێتیە، چونکە بەرپرسیارێتی واتە پابەندبوون بە قەرەبوکردنەوە، خەمڵاندنی بڕی قەرەبوش بەپێی زیانەکە دەبێت. [٢٤].

- زیانگەیاندن لە بواری پزیشکیدا ئەو ئازارەیە لە ئەنجامی کارێکی نا یاسایی پزیشکەوە توشی نەخۆش دەبێت لە جەستەیدا، یان سامانیدا، یان لە هەستو سۆزیدا. [٢٥].
- زیان ئەو حاڵەتەیە لە ئەنجامی کردن یان نەکردنی کارێك کەموکورتیەك دروست ببێتو، بەهایەکی ماددی یان مەعنەوی، یان هەردوکیانی بۆ کەسی زەرەرمەند هەبێت. [٢٦].

زیانی پزیشکیی: ئەو بارەیە لە ئەنجامی کارێکی پزیشکیەوە زیان بە نەخۆش دەگاتو، بە شوێنیدا کەموکورتی لە ڕەوشی ماددی، یان مەعنەوی، یان سۆزی نەخۆشدا دروست بکات، گەیاندنی زیان بە نەخۆش پایەیەکی سەرەکی دروستبونی بەرپرسیارێتی پزیشکیە، ئەو بەرپرسیاریەش وەك تیۆری گشتی بەرپرسیارێتی وایە، دەبێت زیان گەیاندن ڕوبدات ئەوکات پزیشك دەکەوێتە بەردەم لێپرسینەوە، چونکە ڕودانی هەڵە بە تەنیا نابێتە بەڵگە بۆ بەرپرسیارێتی پزیشك، بەڵکو دەبێت بە هۆی هەڵە پزیشکیەکەوە زیان بە نەخۆش گەشتبێت. چونکە لە بنەڕەتدا دروستبونی بەرپرسیارێتیو، بە تایبەت بەرپرسیارێتی شارستانی قەرەبوکردنەوەی ئەو زیانەیە لە نەخۆش کەوتووە، هەر ئەمەش وایکردوە زیان گەیاندن بە پایەیەکی بەرپرسیارێتی پزیشکیی دابنرێت. [٢٧].

دووەم: جۆرەکانی زیان:

زیان لێ کەوتنی پزیشکیی زیانێکی ماددیە، یان مەعنەویە، یان لە دەستدانی هەلە.

١ – زیانی ماددی:

زیانی ماددی دەربڕی ئەنجامی داراییە، خۆی لە تێچوی دەرمانو چارەسەردا دەبینێتەوە، کە لە ئەنجامی دەستدرێژی کردنی ڕاستەوخۆی سەر جەستەیە، بەرکەوتنی ئەو تایبەتمەندیەیە کە مافی ژیانو پاراستنی جەستە دەستەبەری کردوە، زیانی ماددی زیانی جەستەیو زیانی داراییش دەگرێتەوە. [٢٨].

﴿زیانی ماددی ئەو زیانەیە لە کەسێك دەکەوێت لە جەستەیدا، یان لە داراییدا، یان لە کەمکردنی مافی دارایی، یان لە دەستدانی بەرژەوەندیەکی ڕەوا، سودەکەی بە داراییو سامان بنرخێنرێ. [٢٩].

أ – زیانی جەستەیی:

لە زیانە ماددیەکان زیانی جەستەییە، دکتۆر منصور المعایطة بەم شێوە لێی دەدوێ: ﴿زیانی جەستەیی ئەو زیانەیە بەر جەستەی مرۆڤ دەکەوێتو، مافی ڕەوای پاراستنی جەستەو ژیانی زیانلێکەوتوو پێشێل دەکات، ئەرکو پابەندبوونی پیشەیی پزیشك لە کاتی ئەنجامدانی کاری پزیشکیدا ڕێزگرتنی مافی ژیانو پاراستنی جەستەی نەخۆشە، ئامانجی کاری پزیشکیی دەبێت بۆ بەرژەوەندی نەخۆش بێت. هەر دەستدرێژیەك بکرێتە

سەر ژیان‌و جەستە بە زیان دادەنرێت، لەناوچون، یان تێکچون، یان کەمئەندامبونی ئەندامێکی لاشە بە زیانی جەستەیی‌و دەستدرێژی دادەنرێت بۆسەر ژیانی زیانلێکەوتوو﴾. [٣٠]

زیانی جەستەیی ئەو زیانەیە پەیوەندی بە ژیان‌و سەلامەتی مرۆڤەوە هەیەو، توشی خەسارەتی دەکات، وەك برینداربونی جەستەو، ڕودانی کەمئەندامی‌و، مردن‌و، پەککەوتنی هەمیشەیی، یان کاتیی. [٣١]

ب - زیانی دارایی:

مەبەست لە زیانی دارایی لە بواری پزیشکیدا ئەو زیانەیە لە ئەستۆی دارایی کەسی زیان لێکەوتوو دەکەوێت، زیانەکەش ئەو زیانە داراییە لە نەخۆش دەکەوێت، وەك خەرجیەکانی چارەسەر کردن‌و، دەرمان‌و، مانەوە لە نەخۆشخانە، سەرەڕای ئەوەی کەسی زیان لێکەوتوو بەدەستهێنانی داهاتی لە دەستدەچێت، لەوانەیە زیانی دارایی کەسی زیان لێکەوتوو تێپەڕێنێت، بۆ نموونە: لەوانەیە زیانی دارایی بەوانەش بگات کە زیانلێکەوتوو خەرجی کێشاون، وەك هاوسەرو منداڵ‌و کەسانی دیکە، ئەوانەی زیان بە بەرژەوەندیان گەشتووە دەتوانن داوای قەرەبوکردنەوە بکەن.
مازۆو تانك دەڵێن: ﴿ زیانی دارایی هەموو ئەو زیانانەیە دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی ئەستۆی دارایی زیان لێکەوتوو﴾. [٣٢]

ج - زیانی مەعنەوی:

زیانی مەعنەوی ئەو ئازارەیە بە ماف یان بەرژەوەندی کەسێك دەگات‌و، ئازارێکی مەعنەوی‌و دەروونی بۆ زیان لێکەوتوو دروستدەکات، ئەم جۆرە زیانە ڕاستەوخۆ بە جەستەو دارایی مرۆڤ ناگات، بەڵکو بە هەست‌و سۆزی دەگات. [٣٣]

زیانی مەعنەوی ئەو زیانەیە لایەنی دارایی ناگرێتەوە، بەڵکو لایەنی کۆمەڵایەتی‌و، کەسایەتی دەگرێتەوە، وەك ناوبانگی کەسەکە، یان ناوبانگی خێزانەکەی، یان ناوزڕاندنی، لەوانەیە زیانی ماددیشی لێ بکەوێتەوە، یان لەوانەیە سروشتی ماددی نەبێت، بەڵکو شتی دیکە بگرێتەوە وەك: بیروبۆچوون. دکتۆر سەنهوری دەڵێ: زیانی مەعنەوی ئەو زیانەیە بەر دارایی کەسەکە ناکەوێت، بەڵکو بەر لایەنێك دەکەوێت دارایی

نییه. ڕێسای گشتی ئەوەیە قەرەبوو کردنەوە چۆن زیانی ماددی دەگرێتەوە، بە هەمان شێوە زیانی مەعنەویش دەگرێتەوە. [٣٤].

ماددەی (١/٢٠٥)ی یاسای شارستانی عێراقی ژمارە (٤٠)ی ساڵی ١٩٥١ دەڵێ: ﴿ مافی قەرەبوکردنەوە زیانی ئەدەبیش –مەعنەوی– دەگرێتەوە، هەروەها هەموو دەستدرێژی کردنێك بۆ سەر ئازادی، یان ناموس، یان پلەوپایە، یان ناوبانگ، یان پێگەی کۆمەڵایەتی، یان بایەخی دارایی کەسێك وادەکات دەستدرێژیکار بەرپرس بێت لە قەرەبو کردنەوە﴾.

سێیەم: مەرجەکانی زیان:

بۆ ئەوەی بتوانرێت بڕیار لەسەر قەرەبوکردنەوەی زیان لێکەوتوو بدرێت، دەبێت ئەم سێ مەرجەی تێدابێت، ( زیانەکە ڕوبدات، زیانەکە ڕاستەوخۆ بێت، زیانەکە لە مافێك یان بەرژەوەندیەکی ڕەوا کەوتبێت).

١ – دەبێت زیانەکە ڕوبدات:

واتە ئەو زیانەیە بە دڵنیایەوە ڕوبدات، ئیتر ئێستا ڕوبدات یان لە داهاتودا ڕوبدات، ئەگەر زیانەکە گریمانە بوو، دڵنیا نەبوین لە ڕودانی نابێتو دروست نییە داوای قەرەبوی بکرێتەوە. [٣٥].

بەدیهاتنی زیان مەرجێکە لە مەرجەکانی قەرەبوکردنەوە، زیانی چەسپیو ئەو زیانەیە دڵنیاین لە ڕودانی، ئیتر ئێستا ڕوبدات یان لە داهاتودا ڕوبدات، قەرەبوکردنەوەش تەنیا بۆ زیانە چەسپیوەکان دەبێت، بەڵام ئەو زیانانەی لەوانەیە ڕوبدات قەرەبو ناکرێنەوە.[٣٦].

٢ – زیانەکە ڕاستەوخۆبێت:

دکتۆر سلێمان مەرقەس دەڵێ: دەبێت زیانەکە ڕاستەوخۆبێت، واتە زیانەکە ئەنجامێکی سروشتی جێ بەجێ نەکردنی پابەندبوون بێت. [٣٧].

زیانی ڕاستەوخۆ ئەو زیانەیە ئەنجامێکی سروشتی جێ بەجێ نەکردنی پابەندبوونە، یان دواخستنی جێ بەجێ کردنیەتی، برگەی یەکەمی ماددەی (٢٠٧)ی یاسای شارستانی عێراقی ئاماژەی پێ کردوەو دەڵێ: ﴿ لە هەموو بارێکدا دادگا بڕی قەرەبوو دەخەمڵێنێ

به ئەندازەی ئەو زیانەی بەر زیان لێکەوتوو کەوتووە، یان بە ئەندازەی ئەو دەستهاتەی لە دەستی چووە، بە مەرجێك ئەو زیانە ئەنجامێکی سروشتی کارێکی ناڕەوا بێت. واتە ئەو زیانەی دەکرێ قەرەبوی بکرێتەوە ئەو زیانەیە ئەنجامێکی ڕاستەوخۆی سەرپێچی کردن و پێشێلکردنی ئەو پابەندبوونە یاسایەیە کە نابێت زیان بەکەس بگەیەنرێ. (٣٨).

ڕێسای بەرپرسیارێتی شارستانی چ گرێبەستی بێت، یان درێخی کردن بێت، ئەوەیە: هەر زیانێك ڕاستەوخۆ نەبێت قەرەبوو ناکرێتەوە، بەڵکو تەنیا زیانی ڕاستەوخۆ قەرەبو دەکرێتەوە. (٣٩).

### ٣ - زیانەکە لە مافێك یان بەرژەوەندیەکی ڕەوا کەوتبێت:

ئەو زیانەی دەکرێ قەرەبوو بکرێتەوە، دەبێت زیانی بە مافێکی زیان لێکەوتووەکە گەیاندبێت، یان زیانی بە بەرژەوەندیەکی دارایی ڕەوای زیان لێکەوتوو گەیاندبێت، وەك ئەوەی کەسێك بکوژرێت، هەندێك خزمی بەخێو کردبێت، بەڵام پابەند نەبووبێت بە بەخێوکردنیان، ئەو خزمانە ئەگەر سەلماندیان کوژراوەکە بمایە بەردەوام دەبوو لە بەخێوکردنیان، دەتوانن بە مەبەستی قەرەبوکردنەوە دژی بکوژەکە لە دادگا سکاڵا بەرزبکەنەوە، خۆ ئەگەر زیانەکە بەر مافێك یان بەرژەوەندیەکی رەوا نەکەوت، مافی قەرەبوکردنەوەیان نییە. (٤٠).

بۆ ئەوەی سکاڵای داواکاری قەرەبوکردنەوە پەسەند بێت، دەبێت بەرژەوەندی کەسیی تێدابێت، وەك ئەوەی زیان بە کەسێك بگات و پەکی بخات و، توانای کارکردنی نەمێنێ، بەو هۆیەوە نەتوانێت خەرجی ئەوانە بکێشێت کە بەخێوی دەکردن، ئەوکات هەموو بەخێوکراوەکان مافی داواکردنی قەرەبویان هەیە، بەپێی ئەو زیانەی لێیان کەوتووە، ئەم قەرەبوکردنەوە جیایە لەو بڕەی زیان لێکەوتوو بۆ چاککردنەوەی زیانەکە داوای دەکات. ئەگەر قوربانییە بەخێوکەرەکەی کەسانی دیکە مردو، داوای قەرەبووی نەکردبوو، ئەوا ماف داوای قەرەبوو کردنەوە دەگوێزرێتەوە بۆ میراتگرانی دوای خۆی ، دەتوانن داوای قەرەبووی مردووەکەیان و، ئەو زیانەش بکەن کە بە هۆی ڕووداوی بەخێوکەرەکەیان لییان کەوتووە، مەگەر قوربانییەکە لە ژیانیدا دەستبەرداری ئەو مافەی بووبێت و وازی لێهێنابێت ، ئەو کات تەنیا داوای قەرەبووی ئەو زیانە دەکەن کە لێیان کەوتووە .

بڕی ئەو قەرەبووکردنەوەش نابێت بە میراتیو، لە نێوان میراتگراندا دابەش ناکرێت، بەڵکو تەنیا بە زیان لێکەوتووان دەدرێت ئەگەر چی میراتگریش نەبن. - چونکە میراتی بریتیە لەو سامانە مردوو لە کاتی ژیانیدا کۆی کردوەتەوەو دوای مردنی لێی بەجێماوە[٤١].

## لقی سێیەم

## پەیوەندی نێوان زیانو هۆکارەکەی

مەبەست لە پەیوەندی هۆیەتی (العلاقة السببية) بوونی پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆیە لە نێوان ئەو هەڵەیە پزیشك کردویەتیو ئەو زیانەی بە نەخۆش گەشتووە، بوونی پەیوەندی هۆیەتی پایەیەکی بنەڕەتی دروستبونی بەرپرسیارێتی پزیشکییە، بۆ دروستبونی بەرپرسیارێتی لە بواری هەڵەی پزیشکیو ڕودانی زیان، دەبێت ئەو زیانەی بەر نەخۆش گەوتووە ئەنجامی ڕاستەوخۆی ئەو هەڵە بێت کە پزیشك دروستی کردووە.[٤٢]

پەیوەندی هۆیەتی لە بەرپرسیارێتی گرێبەستیدا ئەوەیە زیانەکە ئەنجامێکی ڕاستەوخۆی جێ بەجێنەکردنی پابەندبوونی قەرزار بێتو، لە بەرپرسیارێتی درێخی کردنیشدا ئەنجامی ڕاستەوخۆی پێشێل کردنی ئەرکێکی یاسایی بێت.[٤٣]

بۆ دروستبوونی بەرپرسیارێتی پزیشك بە تەنیا ڕودانی هەڵەو زیان گەیاندن بە نەخۆش بەس نییە، بەڵکو دەبێت لە نێوان هەڵەکردنو زیان گەیاندندا پەیوەندی هۆیەتی هەبێت، بە جۆرێك یەکەم (هەڵەکە) هۆی ڕودانی دووەم (زیانەکە) بێت.[٤٤]

یاسادانەری عێراقی پەیوەندی هۆیەتی بە یەکێك لەو توخمانە داناوە بەرپرسیارێتی لێدەکەوێتەوە، لە ماددەی (٢٠٢)ی یاسای شارستانی عێراقیدا دەڵێت: ﴿ هەر کارێك زیان بە کەسێك بگەیەنێت، ئەوەی زیانەکەی گەیاندوە پابەند دەکرێت بە قەرەبوو کردنەوە﴾.

پەیوەندی هۆیەتی پایەیەکی سەربەخۆیە لە پایەکانی هەڵەکردنو زیان گەیاندن، لەوانەیە زیان ڕوبداتو، زیانەکە پەیوەندی بە هۆکارەکەوە هەبێت، لە هەمان کاتدا دەکرێت کارەکە

زیانی گەیاندبێت بەڵام هەڵەی تێدا نەکرابێت، یان دەکرێت هەڵە کرابێت‌و زیانیش ڕویدابێت، بەڵام پەیوەندیان بە یەکترەوە نەبێت، هەرچەند پزیشك هەڵە بکات‌و، نەخۆشیش زیانی پێ بگات بەرپرسیارێتی دروست نابێت ئەگەر پەیوەندیان بە یەکترەوە نەبێت، بەڵکو دەبێت زیانەکە ئەنجامی هەڵەکە بێت، واتە: لە نێوان هەڵە پزیشکیەکەو زیان لێکەوتنەکەدا پەیوەندی هۆیەتی هەبێت، بڕیاردان لەسەر پەیوەندی هۆیەتی لە کاری پزیشکیدا لە هەڵەی ئاسایدا ئاسانترە وەك لە هەڵەی پیشەیی ( هونەری)) هەیە، چونکە هەڵەی ئاسایی لەو ڕوداوانەدا هیچ لێڵیەکی تێدا نییە، نموونەی هەڵەی ئاسایی : لەبیرچونی ئامێرێك یان پارچە شاشێك لە سکی نەخۆشدا کە زیانێکی لێ بکەوێتەوە، لەو بارەدا پەیوەندی هۆیەتی هاتووەتە دی‌و، دادوەر بە ئاسانی دەتوانێت جیای بکاتەوە، بەڵام هەڵەی هونەری سەخت‌و گرانە، بۆیە دادوەریش بۆ دیاریکردنی پەیوەندی هۆیەتی پشت بە شارەزا دەبەستێت، چونکە سروشتی جەستەی مرۆڤ ئاڵۆزو ناڕونە، زۆرجار هۆکارەکانی پەرەسەندنی نەخۆشیەك جیاوازن، یان هۆکارەکەی نازانرێت، زۆرجار پسپۆڕانی تایبەتمەندیش لەبەردەم هۆکارەکاندا سەرسام دەمێنن، بەبێ ئەوەی پەیبەرن پێی‌و بزانن کام هۆکار ڕۆڵی سەرەکی لە پەرەسەندنی نەخۆشیەکەدا هەیە.[٤٥].

**یەکەم: سەلماندنی پەیوەندی هۆیەتی:**

د.عبدالرزاق السنهوری دەڵێ: سەلماندن بەڵگە هێنانەوەیە لە بەردەم دادوەریدا بەو ڕێگایانەی یاسا دیاری کردون لەسەر بوونی ڕوداوێکی یاسایی ئاسەواری لێ بکەوێتەوە.

بێگومان پرسی سەلماندن گرنگترین پرسی یاسایەو، لە چوارچێوەی بەرپرسیارێتی بە گشتی‌و، بەرپرسیارێتی شارستانیدا بە تایبەتی جێگایەکی بڵندی هەیە. بوون‌و نەبوونی هەموو مافێك بەندە بە سەلماندنەوە، ماف ئاواتێکی چاوەنواڕ کراوو پێگەیەکی شلۆقە، تا بەڵگەی لەسەر دەهێنرێتەوەو، دەبێتە مافێکی بە دەستهاتوو جێگیر.[٤٦].

لە بنەچەدا داواکاری قەرەبوکردنەوە دەبێت هەموو پایەکانی بەرپرسیارێتی بسەلمێنێت، لە نێویشیاندا پەیوەندی هۆیەتی، لە ڕاستیدا سەلماندنی ئەم پەیوەندیە لە ڕێی گرینەی بارودۆخەکەوە ئاسانە.[٤٧].

لە باسی تاوانکاریدا ڕێسای گشتی وایە گومان لە بەرژەوەندی تۆمەتبار لێکبدرێتەوە، لە بەرامبەریشدا لە بەرپرسیارێتی شارستانیدا ئاراستەی گشتی بەرەو یارمەتیدانی

زیانلێکەوتوو دەچێتو، لە هەموو بارەکاندا ئاسانکاری بۆ دەکرێت قەرەبو وەربگرێت ... ئەگەر دادوەر بچوکترین گومانی لە داوالەسەر کراو دۆزیەوە بە بێ دوودڵی قەرەبوکردنەوەکە دەخاتە ئەستۆی.[٤٨]

هەرچۆن سەلماندنی هەڵەو زیان گەیاندن کە پایەکانی بەرپرسیارین دەکەونە ئەستۆی نەخۆش، بە هەمان شێوە سەلماندنی پەیوەندی هۆیەتیش دەکەوێتە ئەستۆی نەخۆش، سەلماندنی پەیوەندی هۆیەتی لە زۆربەی دۆخەکاندا ئاسانە، ئەویش بە هۆی گرینەکانو حاڵەتەکەوە بە زۆری پەیوەندی هۆیەتی لە نێوان هەڵەو زیاندا ڕوونەو سەلماندنی پێویستی بە هەوڵێکی زۆر نییە. . هەرکات زیان لێکەوتوو هەڵەکردنو زیان گەیاندنی سەلماندو. ئەو هەڵەش لەوانە بێت ئەو زیانە بگەیەنێت گرینە لەسەر بوونی پەیوەندی هۆیەتی لە نێوانیاندا لە بەرژەوەندی زیان لێکەوتوو دەبێت.[٤٩]

ئەگەر پزیشکی چارەسەرکار بیەوێت بوونی پەیوەندی هۆیەتی دووربخاتەوەو، بەرپرسیارێتی لە ئەستۆی خۆی لاببات، دەبێ بیسەلمێنێ لەو زیانەدا هۆکاریتر بەشدارن. وەك چۆن لە ماددەی (٢١١)ی یاسای شارستانی عێراقیدا هاتووە: ﴿ ئەگەر کەسەکە سەلماندی زیانەکە بە هۆیەکی دەرەکیەوە ڕویداوە، وەك: **نەردێکی ئاسمانی،یان ڕوداوێکی لەناکاو،یان هێزێکی زاڵو بەتوانا،یان کرداری کەسێك،یان هەڵەی زیان لێکەوتوو**،دەستی ئەوی تێدا نییە، پابەند نابێت بە گرەنتی دەستەبەر کردنەوە، ئەگەر دەقێك یان ڕێکەوتنێکی پێچەوانەی ئەوە نەبێت﴾

**دووەم: تیۆرەکانی هۆیەتی:**

زۆرجار لەبەر دوو هۆ پەیوەندی هۆکارەکان ئەندازەگیری ناکرێن،

**هۆی یەکەم:** لە یەك هۆ چەند ئەنجامێك دەکەوێتەوە.

**هۆی دووەم:** لە یەك زیان گەیاندندا چەند هۆیەك بەشدارن.

ئەگەر لە یەك هەڵەوە چەند ئەنجامێك دروستبوو پەیوەندی هۆ بۆ ئەنجامەکانی ئەو هەڵە ڕاستەوخۆ دێتە دی، ئەو ئەنجامانەش بە زیانی ڕاستەخۆ دادەنرێن، بەڵام ئەگەر بۆ ڕودانی زیانێك چەند هۆیەك بەشداربن، وەك ئەوەی کەسێك نەخۆشی دڵی هەبێتو لێی او مرد، ئەگەر ئەو کەسە ساقلەم بوایە بەو لێدانە نەدەمرد، لەم بارەدا خەملاندنی

بوونی هۆ زۆر وردە. بۆ ئەمە چەند تیۆرێك هەن ئەو هۆیە دیاری دەکەن کە ئەنجامی سروشتی زیانەکەیە،

١ - **تیۆری فرەیی یان یەکسانی:** بەپێی ئەم تیۆرە بە جیا دیراسەی هەموو هۆکان بکرێت، تا ئەو هۆیە دەستنیشان‌و دیاری بکرێت ئەگەر ئەوە نەبوایە ئەو زیانە دروست نەدەبوو، لەم تیۆرەدا هەموو هۆکان یەکسانن، لە نموونەکەی سەرەوەدا بۆ مردنی کەسەکە هەردوو هۆکە لێدانەکەو نەخۆشی دڵەکە وەك یەکن.

٢ - **تیۆری هۆی کاریگەر یان بەرهەمهێن:** لە کاتی بوونی فرە هۆیی دەبێت جیاوازی بکرێت لە نێوان هۆی لاوەکی‌و هۆی سەرەکی، لە نموونەکەی سەرەوەدا هۆی دووەم بە هۆی سەرەکی دادەنرێت، واتە نەخۆشی دڵەکە هۆی کاریگەر بووە لە مردنەکەدا. . . دادوەریی عێراقی پشتی بە تیۆری دووەم دەبەستێت.[٥٠]

خاڵی دووەمی ماددەی (١٦٩)ی یاسای شارستانی عێراقی دەڵێ: ﴿ قەرەبوکردنەوە لەسەر هەموو پابەند بونێکە. . . بە مەرجێك ئەمە ئەنجامێکی سروشتی جێبەجێ نەکردنی پابەندی قەرزار بێت، یان جێبەجێ کردنەکەی دوابخات﴾. بناغەیەکی یاساییە بۆ پارسەنگدانەوەی تیۆری هۆی کاریگەر.[٥١]

تایبەت بە بوونی پەیوەندی هۆو ڕوودانی زیان دادگای تێهەڵچونەوەی نینوی لە بڕیاری ژمارە ٤٢/س/١٩٩٣ لە ١٩٩٣/٥/١٣دا ئەم بڕیارەی دا: ﴿ دادگا سەلماندی لە نێوان هەڵەی پزیشك‌و دروستبوونی زیان کە مردنە پەیوەندی هۆیەتی نییە، مردنەکە لە ئەنجامی ئەو هەڵەوە نەبووە کە دروستبووە، هیچ پەیوەندیەك نییە لە نێوان درێخی کردنی پزیشك‌و ئەو زیانە ڕویداوە، مردنی نەخۆشەکە چاوەڕوان کراو بووە، لەسەر ئەوە دادگا بڕیاریدا پشتگیری دادگای بەرایی بکات‌و، تانەی تێهەڵچونەوەکەش پەرچ دەداتەوە﴾. ئەمە مانای ئەوەیە دادوەر توانی لە ڕێی شارەزاییەوە واتە ڕاپۆرتی پزیشکی دادیەوە نەبوونی پەیوەندی هۆ بسەلمێنێ، واتە پزیشکەکە بەرپرسیار نییە لە مردنەکە.[٥٢]

بڕیاری ژمارە (١٢٧)ی بەشی یاسایی وەزارەتی تەندروستی عێراقی لە ٢٠٠٢/٢/٢٨ بڕیاریدا بە پابەند کردنی پزییشکی داوا لەسەرکراو بە پێدانی بڕی دوو ملیۆن‌و بیست‌و پێنج هەزار دینار بە داواکار بە پشت بەستن بە حوکمی ماددەی (٢٠٤و ٢١٧)ی یاسای

شارستانی عێراقی، ئەوەش لەبەر کەمتەرخەمیو وریا نەبوون لە بەدوادا چوونو سەرپەرشتی کردندا، کە بوو بە هۆی لەبیرچونی پارچەیەك شاش لە جەستەی نەخۆشەکەدا.[٥٣]

## لقی چوارەم

## هەڵەی پزیشکیی لەفیقه ویاساو دادوەریو کارگێڕیدا

### یەکەم: هەڵەی پزیشکیی چی یە؟

**١ - پزیشکیی لە زماندا:**

کارامەیی، سەلیقە، دانایەتی، وردەکاریی، چارەسەری جەستەو دەروون.[٥٤]

**٢ - پزیشکیی لە زاراوەدا:**

أ - ئیبن سینا دەڵێ: ﴿پزیشکیی زانستێکە لە ڕێیەوە دەزانرێ بارودۆخی تەندروستی مرۆڤ چۆن ساقلەم دەبێتو، چۆن نەخۆش دەکەوێت، تا پارێزگاریی لە تەندروستی بکاتو، ئەگەر تەندروستیشی تێکچوو بیگێڕێتەوە باری ئاساییو ساقلەمی﴾.[٥٥]

ب - ﴿پزیشکیی زانینی ڕێکارە تەندروستیەکانی خۆپاراستنو چارەسەرکردنی مرۆڤو ئاژەڵو، دەستنیشان کردنی نەخۆشی یە﴾.[٥٦]

**٣ - هەڵەی پزیشکیی:**

هەڵە لە بواری پزیشکیدا کردارێکە ئەو کاتە دەردەکەوێت کە پزیشك لە ئەرکی پیشەیی خۆیدا سەرپێچی دەکات، وەك بایەخنەدان بە کارەکەیو، وریانەبوون تیایداو، ڕەچاو نەکردنی بنەما زانستیەکان. واتە پزیشك بەرامبەر نەخۆشەکەی درێغی دەکاتو گوێی پێنادات. ئەگەر لەو ڕەفتارەی پزیشکەوە زیان بە نەخۆش بگات هەڵەی پزیشکیی دروست دەبێت. چونکە دەبێت پزیشك پابەند بێت بەو یاساو ڕێنماییە تەندروستیانەوە کە پیشەی پزیشکیی ڕێکدەخەن، بە ڕەچاوکردنی دۆخە تایبەتەکان، چ دەرەکیی بێت یان ناوەکیی، دۆخی دەرەکیی ئەو کاتو شوێنە دەگرێتەوە پزیشك کاری تێدا دەکات، وەك ئەوەی لە فڕۆکەیەکدا داوا بکرێت لە پزیشکێك چارەسەری نەخۆشێك بکات، لێرەدا

دەكرێت پزیشك پابەند نەبێت بە بناغەی باوی زانستیەوە، بەپێی فیقهی شارستانیش لە كاتو باری ناچاریدا بەرپرسیارێتی هەڵدەگیرێتو نامێنێت.[٥٧]

بۆ ئەوەی بزانین پزیشك چەندە سەرپێچی لە ئەركو پیشەكەیدا كردووە، دەبێت بگەڕێینەوە بۆ پرەنسیپە جێگیرەكانی پیشەی پزیشكیو ئەو ڕێسایانەی لە پیشەدا باون. كرداری پزیشك كاتێك بە هەڵە دادەنرێت كە بە ویژدانێكی وریاو زیندووەوە بایەخ بە نەخۆشەكە نەداتو، ئەركی خۆی ئەنجامنەدات، یان بایەخ پێدانەكەی بەپێی ڕاستییە زانستیەكان نەبێت... ئەمە هەڵەی پیشەییە، بەڵام هەڵەی ئاسایی یان ماددی ئەو هەڵەیە پزیشك لە كاتی كار كردنیدا تێی دەكەوێت، لە ڕودانەكەیدا هیچ پەیوەندییەكی بە پرەنسیپی پیشەیی و هونەرییەوە نییە، هەڵەی ئاسایی وەك لەبیرچوونی پارچە شاشێك یان هەرشتێك لە جەستەی نەخۆشدا دوای نەشتەرگەری. یان چارەسەر كردنی نەخۆش و نەشتەرگەری كردن لە كاتی سەرخۆشیو بەكارهێنانی مادده هۆشبەرەكاندا ، یان ئەنجامدانی نەشتەرگەری بەبێ ستاف پزیشكی لە كاتێكدا بوونی ئەو ستافە پێویستبێت. لە هەموو ئەو بارو شێوانەدا لێپرسینەوە لە پزیشك دەكرێت.[٥٨]. ئەگەرچی هەڵەی مرۆڤ یان هەر ئامێرێك لە هەموو كاتێكدا ڕودەدات، بەڵام هەستیاریی بارودۆخەكە لە كەرتی پزیشكیدا كە مامەڵەكردنە لەتەك ژیانو تەندروستی مرۆڤدا ئەوە دەخوازێت بڵێین: هەڵەی پزیشكیی ئەگەرچی ئەستەمە ڕونەدات، بەڵام لە لایەنی مرۆڤایەتیو كۆمەڵایەتیو مۆراڵیەوە پەسەند نییە.

**دووەم: هەڵەی پزیشكیی لە فیقهدا:**

١ – د. منصور عمر المعايطة بەم شێوە پێناسەی دەكات: ﴿هەڵەی پزیشكیی هەموو سەرپێچی یان دەرچونێكی ڕەفتاری پزیشكە لەو ڕێساو بنەما پزیشكیانە كە زانست یەكلای كردونەتەوە، یان بە شێوەیەكی تیۆریو پراكتیكی لە جێبەجێ كردنی كاری پزیشكیدا باون، یان پێشێل كردنی ئەركەكانی وریاییو پارێزكردنە كە یاساو ئەركی پیشە دەیسەپێنێ بەسەر پزیشكدا، كردارەكەی ئەنجامی خراپی لێ بكەوێتەوە، لە كاتێكدا دەیتوانیو ئەركیشی بوو لە هەڵسوكەوتیدا وریاو بە ئاگا بێت تا زیان بە نەخۆشەكە نەگەیەنێت﴾.[٥٩]

٢ - **د.محمد عبدالنباوي دەڵێ:** ﴿ هەڵەی پزیشکیی پێشێل کردنی پابەندبوونێکی پێشووە، پزیشکێك لە میانەی کارەکەی یان بە هۆی کارەکەیەوە دەیکات، هەر پزیشکێکی وریاو هۆشیار لە هەمان بارودۆخی دەرەکی ئەو پزیشکەدا بێت نایکات ﴾. (٦٠).

٣ - د . منذر الفضل دەڵێ: ﴿ هەڵەی پزیشکیی پێشێل کردنی پزیشکە لە ئەرکەکەیدا، ئەویش درێغی کردنە لە چاودێریکردنێکی ورد بە ویژدانێکی وریاوە کە لەگەڵ ڕاستیە زانستیە جێگیرەکاندا یەکبگرێتەوە ﴾. [٦١]

٤ - د. وفاء ابو جميل دەڵێ: ﴿ هەڵەی پزیشکیی درێخی کردنە لە ڕەفتاری پزیشکیدا، کە لە پزیشکێکی وریا ناوەشێتەوە، ئەگەر لە هەمان بارودۆخی دەرەکی پزیشکی بەرپرسدا بێت﴾. [٦٢]

هەڵەی پزیشکی: بریتیە لەوەی پزیشکەکە ئەرکەکانی سەرشانی ئەنجام نەدات، وەك بەوشێوەی پیشەی پزیشکیی دەیخوازێتو سەپاندویەتی. یان سەرپێچی کردنە لە ڕەفتاری پزیشکی ئاسایی. ئەم سەرپێچیەش دەبێت بە دوو بەشەوە: **یەکەمیان هەڵەی درێغی کردنە**، کە لادانە لە پابەندبوون بە یاساوە. **دووەمیان هەڵەی گرێبەستیە**، بە مانای سەرپێچی کردن لە پابەندبوونێکی گرێبەستی، لە یەکەمیاندا دەبێت پزیشك توانای خۆی بخاتە گەڕو (Obligation diligence)، درێغی کردن تیایدا سەرپێچییە. بەڵام لە دووەمیاندا پێویستی بە ئەنجامگەیاندنی (Obligation of result) کارەکەو بە کارهێنانی توانایەتی. هەر سەرپێچی کردنێکیش لەو بوارانەدا دەبێتە سەرپێچی گرێبەستیو، ئەوەش دەبێتە هەڵەی پزیشکیی. [٦٣]

**هەڵەی درێغی کردن:** ﴿پێشێلکردنی پابەندبوونێکی یاسایی پێشترە کە لە زانینەوە دروست دەبێت ﴾.

لە پێناسەکەوە دەردەکەوێت هەڵەی درێغی کردن لەسەر دوو پایە ڕاوەستاوە:

**یەکەمیان: پایەی ماددی یان بابەتیی:** کە بریتییە لە سەرپێچی کردن یان زیادەڕۆیی. مەبەست لە زیادەڕۆیی بەزاندنی ئەو سنوورەیە دەبێت کەسەکان لە ڕەفتاریاندا پێوەی پابەندبن ، ئیتر ئەو لادانە بە ئەنقەست بێت یان بە بێ قەست بێت. لادانی بێ مەبەست لە

گویٚ پێنەدان و کەمتەرخەمیەوە دروست دەبێت ، ئەمەش بە پێوەری بابەتیی دیاری دەکرێت نەك پێوەری کەسیی ، چونکە پێوەری کەسیی زیان بە بکەرو زیان لێکەوتووەکەش دەگەیەنێت ، چونکە ئەگەر کەسەکە زۆر وریابوو لەسەر سوکترین هەڵە لێپێچینەوەی لەگەڵدا دەکرێت ، بەڵام ئەگەر کەسەکە لە خۆیدا کەمتەرخەم بوو ئەوا لەسەر زیان گەیاندنێکی گەورە نەبێت لێپێچینەوەی لەگەڵدا ناکرێت، ئەمەش زیان بە زیان لێکەوتووەکە دەگەیەنێت . بەڵام پێوەری بابەتی یان پەتی (مجرد) بۆ کۆنترۆڵ کردنی لادان و سەرپێچی، ئەوەیە پێوانی سەرپێچی بە ڕەفتاری کەسێکی ئاسایی دەبێت کە لە هەمان دۆخی سەرپێچیکاردا بێت، بەبیٚ گوێدانە خودی کەسەکە . بۆ نموونە هەڵەی پزیشکێك بە وریایی و لێهاتنی پزیشکێکی ئاسایی پسپۆڕی هەمان بوار پێوانە دەکرێت .

**دووەمیان: پایەی مەعنەوی زانین‌و پەی پێبردن:** لەبەر ئەوەی ڕێسای یاسایی گوتارێکە ئاراستەی کەسەکان دەکرێت بۆ پابەندکردنیان بە ڕەفتارێکی دیاریکراوەوە، لەبەر ئەوە ئەگەر کەسێك دەرك نەکات بە شتەکان ئاراستەکردنی گوتاریش سودی بۆی نیە، مەگەر یاسا ئەرکێك بسەپێنێت تێگەشتن‌و دەرك پێکردن لە کەسەکە نەخوازێت، هەر لە یاسای ڕۆمانی و سەدەکانی ناوەڕاست و یاسای شارستانی فەڕەنسیو، ئەو یاسایانەیش پێوەی کاریگەر بوون ڕایان وایە دەرك پێکردن توخمێکی بنەڕەتی هەڵەیە... بەلاّم بە مەرج گرتنی بەرپرسیارێتی کاری نادروست لە فیقە و دادوەریی هاوچەرخ و هەندێك یاسا شارستانیە تازەکاندا (دەرك پێکردن) ئەو بایەخەی نەماوە ، چونکە پشتگویٚ خستنی دادپەروەریە، بە تایبەت ئەگەر هەڵەکارەکە دەوڵەمەندو هەبوو بێت‌و، زیان لێکەوتوەکەش هەژارو نەبوو بێت، بەشێك لە فیقەو دادوەریی دەرکپێکردن بە دۆخێکی ناوخۆیی دادەنێن‌و، لە دروستبوونی هەڵەدا بایەخی پیٚ نادەن، وەك یاسای ئەڵمانیاو پۆڵۆنیا و یاسای ئیلتیزاماتی سویسری، دانیان ناوە بە بەرپرسیارێتی ئەو کەسانەی دەرك ناکەن (عدم تمییز)، لە پاڵنەرەکانی ئەم ئاراستەیەش دەرکەوتنی بەرپرسیارێتی یاساییو تیۆری لە ئەستۆگرتنی بەرپرسیاریە. دروستبوونی بەرپرسیارێتی لە زیان پێگەیاندنەوە دەبێت نەك لە هەڵەو دەرك پێکردن، شایەنی باسە فیقهی ئیسلامی لەم بارەوە دانی ناوە بە بەرپرسیارێتی ماددیدا و بایەخ ناداتە توخمی هەڵە لە هەڵسوکەوتدا ، هەرکەس زیان بە خەڵکانی تر بگەیەنێت بەرپرسیارێتی کارەکەی دەکەوێتە ئەستۆ ،

تەنیا لە چوارچێوەیەکی تەسکدا دانی ناوە بە بیرۆکەی هەڵەدا و ناوی ناوە هەڵەی درێغی کردن... [٦٤].

لە پێناسەکانی سەرەوە دەردەکەوێت فەقیهە یاسایەکان کۆکن لەسەر ئەوەی هەڵەی پزیشکیی لە چەمکی کەمتەرخەمیو بایەخ پێنەدانی پێویستدا قەتیس دەبێت. لێرەدا تیشك دەخەینە سەر دوو حاڵەت:

١ - کەمتەرخەمیو گوێپێنەدان، هەڵەکردن تایبەت نییە بە پزیشکی چارەسەرکارەوە بە تەنیا، بەڵکو دەبێت ستافی پزیشکیی وەك یەکەیەکی چارەسەرکاری تەواوکەر سەیر بکرێت، بۆیە بەرپرسیارێتی لە سەر یەك کەس نییە، بەڵکو زۆر کات بەرپرسیارێتی هاوبەشە لە نێوان ستافە پزیشکیەکەدا. ماددەی (١/٢١٧) یاسای شارستانی دەڵێ: (ئەگەر لە کارێکی ناڕەوادا بەرپرسەکان زۆر (فرە)بوون لە پابەندبوونیاندا هاوبەش دەبن لە قەرەبوکردنەوەی زیانەکەدا بەبێ جیاوازیکردن لە نێوان بکەری ڕاستەقینەو بەشدارو هۆکار).

٢ - دەبێت سنوری چەمکی هەڵەی پزیشکیی فراوان بکرێت، چونکە کارەکە پەیوەندی بە ژیانی کەسێکەوە هەیە، لەسەر ئەوە سەلماندنی هەڵە ئاڵۆزو گرانە، هەڵە هەموو ئەم وشانە دەگرێتەوە: ( کەمتەرخەمی، درێغی کردن، دواخستن، کارنەکردنو چاودێریی نەکردن بەپێی پێویست، ئەمە بە مانای ئەوەیە بە بیانوی پێشکەوتنی پیشەی پزیشکیی جیاوازی نەکرێت لە نێوان هەڵەی بچوكو هەڵەی گەورەدا، بەڵکو دەبێت پێشکەوتنی پیشەی پزیشکیی بکرێتە بیانوی هەوڵدانی زیاترو چارەسەر کردنی فراوانتر. [٦٥].
فەقیهی فەرەنسی ( دۆما ) دەڵێ: هەموو ئەو زیانو خەسارەتەی لە کرداری کەسێکەوە دەکەوێتەوە ئیتر ئەو کردارە پەیوەندی بە بەرچاوڕونی یەوە هەبێت، یان پەیوەندی بە هەڵەشەییو نەزانینەوە هەبێت، یان هەر هەڵەیەکی تری هاوشێوە، هەڵە ئەگەرچی ئاسانیش بێت دەبێت قەرەبوی زیان لێکەوتوو بکرێتەوە. [٦٦].

**سێیەم: هەڵەی پزیشکیی لە یاسادا:**

هەڵە لە یاسادا بەوە پێناسە دەکرێت: ﴿کردن یان نەکردنی کارێکە بە ئەنقەست یان بەبێ ئاگایی، دەگەڕێتەوە بۆ جێ بەجێ نەکردنی ئەو پابەندبوونەی لەسەری ڕێکەوتون، یان

گوێڕایەڵی نەکردنی حوکمە یاسایەکانە، یان ئەنجامنەدانی ئەو ئەرکەیە کە دەخوازێت مرۆڤ بە دڵسۆزیو ڕاستگۆیی لە تەك خەڵكدا مامەڵە بكات﴾ [٦٧].

هەڵە بە مانای ( کردنی کارێکی نایاساییە)، یان ( کردنی کارێکە پێچەوانەی یاسایە)، یان (کردنی کارێکە یاسا قەدەغەی کردبێت). ئەمەش هەردوو دیوی ئەرێنیو نەرێنی دەگرێتەوە، وەك کردنی قەدەغەکراوێك، یان ئەنجام نەدانی ئەرکێك). هەندێك لە یاساکان وەك یاسای فەرەنسیو میصریو عێراقی پێناسەی هەڵەی پزیشکیان نەکردوە، هەندێکیش وەك یاسای سعودیو تونسیو لیبیو ئیماراتیو مەغریبی پێناسەیان کردوە، بەڵام ئەگەر لە پێناسە یاسایەکان ورد ببینەوە، پێناسەیەکی گشتگیری یاساییان بۆ هەڵەی پزیشکی نەکردوە، لە ماددەی (٨٤)ی یاسای شارستانی تونسیو ماددەی (٧٧)ی یاسای شارستانی مەغربیدا دەڵێن: ﴿ **هەڵە بریتی یە لە پشتگوێ خستنی کارێك پێویستە بکرێتو، نەکردنی کارێکە کە نەبێت بکرێت، بە بێ مەبەستی زیان گەیاندن**﴾. [٦٨].

یاسادانەری ئیماراتی لە ماددەی (١٤)ی یاسای فیدراڵی ژمارە (١٧)ی ساڵی ٢٠٠٨دا بەم شێوە پێناسەی هەڵەی پزیشکی دەکات: ﴿ **هەڵەی پزیشکیی ئەو هەڵەیە دەگەڕێتەوە بۆ نەزانینی کاروباری هونەریی پیشەکەی کە پێویستە هەرکەس هەر پیشەیەکی هەبێت بیزانێت، یان دەگەڕێتەوە بۆ کەمتەرخەمی، یان هەوڵنەدانی پێویست**﴾. [٦٩].

یاسادانەری فەرەنسی پێناسەی هەڵەی پزیشکیی نەکردوە، نە لە یاسای شارستانیو نە لە یاسای تەندروستی گشتیو نە لە تۆماری ڕەفتاری پزیشکیدا. بەڵام لە ماددەکانی (١١٨٢-١١٨٣)ی یاسای شارستانیدا ئاماژەی بە پایەی هەڵە کردووە، دادوەریش هەڵەی وەك بناغەیەك داناوە بۆ بەرپرسیارێتی پزیشکیی. [٧٠].

یاسادانەری عێراقی پێناسەی هەڵەی پزیشکیی نەکردووە، بەڵام ڕێنماییەکانی ڕەفتاری پیشەیی سەندیکای پزیشکانی عێراقی کۆمەڵێك هەڵەی پزیشکیی دیاری کردووە، کە ئەمانەی خوارەوەیە:

سەندیکا بە پشت بەستن بە بڕگەی یەکەمی ماددەی (٢٢)ی یاسای ژمارە (٨١)ی ساڵی ١٩٨٤، لە دانیشتنی (٨)دا لە ١٩٨٥/٥/١٩ بڕیاری ژمارە (٦)ی دەرکرد، کە ئەم ڕێنمایانە بوون:

**١ – سروشتی بەرپرسیارێتی پزیشکیی:**

بەرپرسیارێتی پزیشك بەرامبەر نەخۆش بەرپرسیارێتی چاودێری کردنە، نەك بەرپرسیارێتی چاکبوونەوە، پزیشك بەرپرسیارە لە هەر ئامێرێك بەکاری دێنیْ، یان لە بەکارهێنانیدا درێخی دەکات. بەرپرسیارە لە ئەنجامی هەر درێغی کردنێك لە ئەرکە ئاساییەکانیدا. – ئیتر ئەو درێغی کردنە بە هۆی– پەلەکردنەوە بێت، یان گویٚ پیٚ نەدان بێت، یان هەڵەشەیی بێت، یان بە هۆی نەزانینی ئەو شتانەوە بێت کە دەبێت هەموو پزیشکێك بیزانێت.

**٢ – بەرپرسیارێتی لە دەستنیشان کردنی نەخۆشیدا:**

پزیشك بەرپرسیار نییە لە هەڵەی دەستنیشانکردنی نەخۆشیدا، ئەگەر سەلماندی پەنای بردوەتە بەر هەموو هۆکارە پزیشکییە ئوسوڵیەکان، یان ئەو ئامرازانەی لە دەڤەرەکەیدا هەبووە بەکاری هێناوە. بەڵام بەرپرسیارە لەو هەڵەی لە ئەنجامی گویٚ پیٚ نەدانی ئەنجامی پشکنینی تیشکیو تاقیگەیی ڕودەدات.

**٣ – بەرپرسیارێتی لە چارەسەر کردندا:**

دەبێت چارەسەرکردن لەسەر بنچینەی دەستنیشان کردن بێتو، هەموو ڕاستیەکانی دەرمانەکە بزانێتو، پزیشك لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا بەرپرسیارە:

أ – لەو شرینقەیەی ڤاکسینی گزازە (تیتانۆس)ە لە کەسێکی نەدات پێکرابێت بە برینێکی قووڵی پیسبوو، ئەوە هیچ جیاوازیەکی نیە لە نۆرینگەکەی خۆیدا لێیبدات، یان لە دامەزراوەیەکدا.

ب – لەو زیانانەی لە ئەنجامی تیشكەو، دەرزیدان لە دەرەوەی دەمارو، گواستنەوەی خوێنو، لە بیرچونی ماددەیەك لە جەستەی نەخۆشدا لە کاتی نەشتەرگەریدا دروست دەبێت.

ج – لەو – زیانەی – لە ئەنجامی چاودێری نەکردنی تەواوی نەخۆش دەکەوێتەوە.

د – ئەنجامی کردنی کارێك پێویست نەبێتو، ئەنجامدانی ئەزمونو تاقیکردنەوە لەسەر مرۆڤ.

هـ – ڕەزامەندی وەرنەگرتنی نەخۆش لەسەر نەشتەرگەری بۆ کردن‌و، ڕون نەکردنەوەی مەترسیەکانی نەشتەرگەریەکە، بەڵام ئەگەر نەخۆشەکە بێهۆش بوو، یان منداڵ بوو، دەبێت کەسوکاری نەخۆشەکە ڕەزامەندبن ئەگەر ئامادەبون.

و – گوێ پێ نەدان‌و بەدەمەوە نەچوونی – نەخۆش – لە کاتی پێویستدا.

ز – درێغی کردن لە ڕاوێژکردنی پێویست لە کاتی گونجاودا. (ڕاوێژکردن بە تەلەفون بەس نییە).

ح – درێغی کردن لە پاکژ کردنەوەی ئامێرە بەکارهاتووەکاندا.

٤ – بەرپرسیاریێتی‌و پسپۆڕیی:

پسپۆڕی ئەوەیە پزیشکێك لە بوارێکدا شارەزایی پەیدا دەکات، بۆیە نابێت سنوری توانای خۆی ببەزێنێ، چونکە ئەوکات بەرپرسیارە لە ئەنجامە خراپەکانی کارەکەی، مەگەر لە کاتی ناچاری‌و پێویستیەکی زۆردا کە ئاستەم بێت پەنا بۆ پسپۆڕ ببرێت.

لەم ڕێنمایەدا پیشەی پزیشکی‌و چەند هەڵەیەکی پزیشکی دیاری کردووە، لە یاسای سزادانیشدا هەڵەی پزیشکیی دیاری کردوە، بەڵام بە گشتی بۆشاییەکی فراوان لە ڕێکخستنی پیشەو کاری پزیشکیدا هەیە، کە دەخوازێت یاسایەکی یەکگرتوو هەبێت هەموو لایەنەکانی ئەو بوارە چارەسەر بکات.

**یاسای سزادانی عێراقی‌و هەڵەی پزیشکیی:**

یاساکان لە ڕێی ڕێسا یاساییە تەوزیمیەکانەوە پارێزگاری لە بوون‌و مافی مرۆڤ دەکەن، لەو یاسانەیش یاسای سزاکانە جەستەی مرۆڤ دەپارێزێ. (ماف)یش ئەو بەرژەوەندیەیە یاسا دانی پێدا دەنێت‌و، پێداگری لەسەر دەکات‌و، لە میانەی بە تاوان ناسینی ئەو ڕەفتارانەی زیان بە جەستەی مرۆڤ دەگەیەنن پارێزگاری لێ دەکات.

لە برگەکانی یەك‌و دووی ماددەی (٤١٢)ی یاسای سزادانی عێراقی ژمارە (١١١)ی ساڵی ١٩٦٩دا دەڵێ:

بڕگەی (١): ﴿ هەرکەس بە ئەنقەست دەستدرێژی کردە سەر کەسێکی دیکە بە بریندار کردن، یان لێدان، یان توندوتیژی کردن بەرامبەری، یان پێدانی ماددەیەکی زیانبەخش، یان هەر کردارێکی تری پێچەوانەی یاسا مەبەستی دروستکردنی کەمئەندامیەکی هەمیشەیی بێت، سزا دەدرێت بە زیندانی کردن بۆ ماوەیەك لە پانزە ساڵ زیاتر نەبێت، کەمئەندامی هەمیشەیی دێتەدی ئەگەر لەو کردارەوە پارچەیەکی لاشە بڕا، یان ئەندامێکی جیابویەوە، یان بەشێکی ئەندامێکی پەڕی، یان سودی نەما، یان سودەکەی کەمی کرد، یان توشی شێتی بوو، یان کەموکورتی لە عەقڵیدا دروست بوو، یان هەستێك لە هەستەکانی بەشێوەیەکی گشتی یان بە شێوەیەکی لاوەکی (بەشەکی) لەکار کەوت، یان تێکچونێکی گەورەی ڕواڵەتی لێ کەوتەوە چاوەنواڕی چاکبوونەوەی لێ نەدەکرا، یان مەترسی لەسەر ژیانی دروست کرد﴾.

بڕگەی (٢): ﴿ سزاکەی زیندانیکردن دەبێت بۆ ماوەیەك لە حەوت ساڵ زیاتر نەبێت، یان بەندکردن دەبێت، ئەگەر لەو کردارەوە کەموکورتی هەمیشەیی دروست بوو، بە بێ ئەوەی تاوانکار مەبەستی بێت ڕوبدات﴾.

لە بڕگەی یەکەمی ماددەی (٤١١)ی سزادانی عێراقیدا توخمەکانی هەڵەی دیاری کردووە، کە ئەمانەن: ( کەمتەرخەمی و گوێپێنەدان، هەڵەشەیی، بێ ئاگایی، خەمنەخواردن، ڕەچاونەکردنی یاساو، سیستەمو، بڕیارەکان). ئەمەش گشتی یەو، هەموو هەڵەیەك دەگرێتەوەو، تایبەت نییە بە هەڵەی پزیشکیەوە، هەر کردارێك یاسا بڕیاری لەسەر کردنی دابوو، ئەوە بە بەکارهێنانی ماف دەژمێرێ‌و، کردنی تاوان نییە.

لە ماددەی (٤١)ی هەمان یاسادا لە ژێر ناونیشانی بەکارهێنانی ماف دەڵێ: ئەگەر کردارێك یاسا بڕیاری لەسەر دابوو ئەو کردارە بەکارهێنانی مافەو، کردنی تاوان نییە.

لە بڕگەی (٢)ی ماددەی (٤١)دا دەبێژێ: ﴿ پرۆسەی نەشتەرگەری کردن‌و، چارەسەر کردن ئەگەر لەسەر بنەمای هونەریی بێت‌و، بە ڕەزامەندی نەخۆش یان نوێنەری یاسایی نەخۆشەکە بیت، یان بێ ڕەزامەندی ئەوانیش بێت، ئەگەر حاڵەتەکە پەلە بوو﴾.

**تێبینی:** ئەوەی جێگای سەرنجە ئەم یاسایە باسی تاوان بە گشتی دەکات، بەوەی هەرکەس دەستدرێژی کردە سەر کەسێکی تر بە سزای بڕیار لەسەردراو سزا دەدرێت، بەڵام تاوانبارو تاوانلێکراوی دیاری نەکردووە، بەڵکو بە شێوەیەکی گشتگیر باسی

کردووە، لەبەر ئەوە ئەم یاسایە سیستەمێکی دیاری کراوی پیشەی پزیشکیی و هەڵەی پزیشکیی دیاری نەکردووە. پزیشك کە مافی چارەسەرکردنی نەخۆشی هەیەو، لە لایەن یاساوە ڕێگا پێدراوە لەوانەیە لە کارەکەیدا هەڵەیەك بکات، بەپێی لۆجیك ناکرێت یەکسان بکرێت لەتەك شۆفێرێکدا کە لە شەقامێکدا بە بێ ئاگایی کەسێك دەشێلێ.

بە گوێرەی بڕگەی (٢)ی ماددەی (٤١)ی یاسای سزادانی عێراقی نەشتەرگەریو چارەسەر کردنی نەخۆش لە لایەن پزیشکەوە دەچێتە خانەی بەکارهێنانی مافو، مومارەسەکردنی پیشەو، بە خزمەتگوزاری گشتیو ئەرکی مرۆڤایەتی دادەنرێت، بۆیە ناڕەوایە ئەگەر لەتەك کەسێکی دیکەدا بەراورد بکرێت کە ئەو مافەی نییە... بۆیە سەرەنجام دەبێت ئەوە بڵێین: یاسای سزادانی عێراقی یاسایەکی گشتی یەو، پیشەو هەڵەی پزیشکیی دیاری نەکردووە. [٧١]

**چوارەم: هەڵەی پزیشکیی لە دادوەریدا:**

دادگای پێداچوونەوەی فەرەنسی لە ٢١/ئەیلول/١٨٦٢دا دووپاتی ئەوەی کردەوە ﴿ هەموو کەسێك پێگەو پیشەیی هەرچی بێت، ملکەچی ڕێسا گشتییەکانی بەرپرسیارێتی شارستانی دەبێت، هەتا پزیشکانیش لەم ڕێسایە هەڵاوێراو نین ﴾.

لە ساڵی ١٩٣٨ لە ئەنجامی کەمتەرخەمی کردنی مامانێك کۆرپەلەیەك مرد، لەگەڵ بوونی گرێبەست لە نێوان پزیشكو نەخۆشەکەدا بە پێی ماددەی (١٣٨٢)ی یاسای شارستانیو، ماددەی (٣١٩)ی یاسای سزادانی فەرەنسی دادوەریی فەرەنسی بەرپرسیارێتی دریغی کردنی جێ بەجێ کرد. [٧٢]

لە سایەی حوکمەکانی دادوەریدا کاری پزیشکیی فراوانبونێکی بەرچاوی بە خۆیەوە بینی، سەرەڕای کاری چارەسەر کردن، دیاریکردنی نەخۆشیو پشکنینی بەکتریولۆجیو شیکاری پزیشکیی بگرێتەوە، دادگای فەرەنسی بەپێی ماددەی (٣٧٢)ی یاسای تەندروستی گشتی هەرکەسێك بەبێ مۆڵەت پشکنینو شیکاری پزیشکیی، یان دیاریکرنی نەخۆشیی، یان چارەسەرکردنی نەخۆشیی ئەنجامدا، کارەکەی بە نایاسایی و پێچەوانەی پیشەی پزیشکیی دادەنرێت.

دەبینین لەم سەردەمەدا کاری پزیشکی گەشە کردنێکی فراوانی بە خۆیەوە بینیوە، سەرەڕای خۆپاراستن‌و چارەسەرکردن پەلی هاوێشتووە بۆ بوارەکانی وەك: ڕێگرتن لە سکپڕی‌و، ڕێکخستنی خۆراکی‌و، وەرزشی‌و، نەشتەرگەری جوانکاری، ئەمەش چەندین مەترسی‌و ئاسەواری زیانبەخشی لێ کەوتووەتەوە کە پەیوەندی بە بەرکەوتنی جەستەوە هەیە وەك: کۆپی کردنی مرۆڤ و پیتاندنی دەستکردو، گۆڕینی ڕەگەز.

ئەوەش سەری بۆ ئەوە کێشا ئەو نەخۆشانەی لە ئەنجامی کاری پزیشکییەوە زیانیان پێ گەشت پەنایان بۆ دادگا برد تا قەرەبووی زیانەکانیان بۆ بکرێتەوە. [٧٣].

بڕیارە دادوەریەکان هەڵەی پزیشکیی بەم شێوە پێناسە دەکەن: ﴿ هەڵەی پزیشکیی ئەو زیانەیە پسپۆڕێکی پزیشکیی بەبێ بوونی هۆکارێکی یاسایی بە نەخۆشی دەگەیەنێت﴾. [٧٤]

**پێنجەم: هەڵەی پزیشکیی لە کارگێڕیدا:**

کارگێڕیی کەسێکی مەعنەوی یەو، هەرگیز ناتوانێت بۆ خۆی هەڵەی ماددی ئەنجام بدات. زانای فەرەنسی (Laubadere) لەم بارەیەوە دەڵێت: ناکرێت هەڵە بدرێتە پاڵ خودی کارگێڕیی، چونکە کارگێڕیی کەسی مەعنەوی یەو، سەخت‌و گرانە تەسەور بکرێت هەڵە ئەنجام بدات. هەڵەش کردارێك یان زیاترە فەرمانبەرێك دەیکات، چ ناسراو بێت یان نەناسراو بێت. [٧٥].

**هەڵەی کارگێڕیی دابەش دەکرێت بۆ:**

١ – **هەڵەی خزمەتگوزاریی:** کارێکی زیانبەخشە، سروشتێکی گێلانەی هەیە، لە ئەنجامی خراپ ڕێکخستن، یان خراپ بەڕێوەبردنی کاری خزمەتگوزاری دروست دەبێت‌و، بەرپرسیارێتی کارگێڕی لێ دەکەوێتەوە.

٢ – **هەڵەی کەسیی (تایبەتی):** ئەو کارەیە دەبێتە هۆ بۆ قەرەبوو کردنەوە، فەرمانبەرێکی گشتی لە دەرەوەی ئەرکەکەیدا، یان بە هۆی ئەنجامدانی ئەرکەکەیەوە دەیکات، سروشتی هەڵەیەکی بە ئەنقەست، یان سروشتی هەڵەیەکی زۆر مەترسیداری هەیە. نەریتی نوێ دوو هەڵەکەی جیاکردوەتەوەو، دانیشی بەوەدا ناوە دەگونجێت لە یەك کاتدا هەردووکیان ڕوبدەن.

### ٣ – هەڵەی کارگێڕیی گشتی:

هەرکات بە هۆی خراپیی سیستەمی کارگێڕییەوە زیانێکی مەترسیدار کەوتەوە، کارگێڕیی بەرپرسیارێتی دارایی ناگرێبەستی دەکەوێتە ئەستۆ.

هەڵەی پزیشکیی لە جومگەی پزیشکی گشتیدا: ﴿ ئەو کارە زیانبەخشەیە فەرمانبەرێك دەیکات کە کاری پزیشکیی ڕادەپەڕێنیٚ‌و، لە فەرمانەکەی دانەبڕابێت‌و پەیوەندی مابێت، یان ئەو زیانەیە کە لەو دیسپلینە خراپەوە دەکەوێتەوە کە جومگەی گشتی پزیشکیی پێشکەشی دەکات﴾. [٧٦]. ئەوەی بۆ ئێمە گرنگە هەڵەی وەزیفی یە، کە ڕاپەڕێنەری کاری پزیشکیی دەیکات، ئەوەش ئەو هەڵەیە کە دەدرێتە پاڵ فەرمانبەرێك یان زیاتر، ئەم هەڵەیە سروشتی کەسیی نییەو، لە خزمەتگوزاری جیاناکرێتەوە، هەڵەی وەزیفیش لە درێغی کردن لە بەجێهێنانی ئەرکەکاندا چڕ دەبێتەوە.

بەپێی ڕێنمایی ژمارە (١٢)ی ساڵی ٢٠٠١ کە لە ژمارە (٣٨٩٣)ی وەقایعی عێراقی لە ٢٠٠١/٨/٢٧ بڵاوکراوەتەوە: هەر نەخۆشێك لە ئەنجامی درێغی کردن‌و کەمتەرخەمی نەخۆشخانەیەکەوە زیانی پێگەشت، کارگێڕی نەخۆشخانەکە لیژنەیەکی ڕاوێژکاری پێکدێنێت، نەخۆشخانەیەك دیاریدەکات کە پێویست دەکات چارەسەری نەخۆشەکەی تێدا بکرێت‌و، بەدواداچون بۆ باری نەخۆشەکە دەکات هەتا ئەو کاتەی بەتەواوی چاك دەبێتەوە ... نەخۆشخانەکە تێچوی چارەسەر کردنەکە لە ئەستۆ دەگرێت ... ئەگەر نەخۆشخانەکە –دریغیکارەکە– پابەند نەبوو، نەخۆشەکە مافی داوای قەرەبوکردنەوەی زیانی ماددی‌و مەعنەوی هەیە لە بەردەم دادگای تایبەتمەندا

# لقی پێنجەم

## مێژووی بەرپرسیارێتی هەڵەی پزیشکیی [٧٧].

بۆ گەڕان بە دوای گەشەکردنی بەرپرسیارێتی پزیشکدا دەبێت ئاگاداری ئەو قۆناغانەبین کە کاری پزیشکیی بڕیویەتی، لەمبارەیەوە دکتۆر فائیق الجوهری دەڵێت: ( ئەو کۆشکەی نازانیت بناغەکەی لەسەر چی دامەزراوە، بێجگە لە بیرۆکەیەکی ڕوکەش و سادەی دیوی دەرەوەی کۆشکەکە نەبێت هیچی تری لێ نازانیت)، بەرپرسیارێتی پزیشکیش وەك هەموو زانست و بابەتەکانی تر بەرهەمی ڕابردووە، هەڵەی پزیشکی و بەرپرسیارێتی یاسایی لە دێر زەمانەوە دروست بوون، چەندین ڕێساو یاسایان بۆ دانراوە، لە خوارەوە بە کورتی ئاماژە بە قۆناغەکانی گەشەکردنی بەرپرسیارێتی و، هەڵەی پزیشکیی دەکەین:

**یەکەم: بەرپرسیارێتی پزیشکی لە سەردەمی فیرعەونەکاندا:**

پزیشکە میصریەکان دەستێکی باڵایان لە پزیشکیدا هەبووە، پێش لە هەزاران ساڵ لە مۆمیاکردنی مردوودا کەس نەگەیشتوەتە ئاستی پزیشکە میصرییەکان، یەکەم کەس بوون فەرمانی ئەندامەکانی لەش و، ڕێڕەوی سوڕی خوێن و، جوڵەی دڵیان زانیوە، یەکەم کەس بوون لە ڕێگای بەرهەمی ئاژەڵەوە چارەسەریان بۆ گلاندەکان بەکارهێناوە، کە تا کۆتایی سەدەی هەژدەیەم ئەو شێوازە بەردەوام بوو... یەکەم کەس بوون خەتەنەکردنیان داهێنا... بەپێی پێشکەوتنی شارستانی میصری پزیشکیش پسپۆڕی زیاتریان وەرگرت، وەك پزیشکی چاو و ددان و بوارەکانی دی...

یەکەم قوتابخانەی پزیشکیان دروست کرد بە ناوی قوتابخانەی (صاللحجر)، قوتابیەکان لە خێزانە ئۆرستۆکراتەکان هەڵدەبژێران، ئەوەش بە یەکەم قوتابخانەی پزیشکی شاهانە دادەنرێت لە مێژوودا... ئەوەی جێی بایەخە یاسادانەری میصری (فیرعەونی) لە بەرامبەر هەڵەی پزیشکەکان گرنگی بە پاراستنی تاکەکان دەدا، بە پەیڕەوکردن لەوەی لە (سفری پیرۆزدا) هاتبوو، بۆچوونی پزیشکە پێشینەکانی تێدابوو، ئەوەش وەك پێشینەیەك دادەنراو، پێچەوانە ڕەفتار کردنی ئەو پێشینە کەسەکەی ڕووبەڕووی سزا دەکردەوە تا ئاستی ئیعدام کردن دەچوو، هۆی پیرۆز ڕاگرتنی ئەو ڕێسایانەش بۆ ئەوە

دەگەڕانەوە، ئەوانەی بیانتوانیبایە ئامرازی چارەسەری باشتر بدۆزنەوە زۆر کەم بوون. چونکە ڕێگا نەدەدرا ئەزموونی نوێ لەسەر نەخۆش بکەن، مەگەر بیانسەلماندایە چارەسەرە پێشوەکان سودیان نەگەیاندووە، لە هەمان کاتدا پزیشك بەرپرسیاربوو لە ئەنجامی ئەزموونە تازەکان.

## دووەم: بەرپرسیارێتی پزیشکی لە سەردەمی بابلیەکاندا:

لە بابل کاتێك پزیشك هەڵەی دەکرد، داوای لێبوردنی لە خواوەندەکان دەکردو، لە هەمان کاتدا لەسەر هەڵەکانی لێپرسینەوەی لێ دەکرا، بۆیە سیستەمی سزادان دانرا تا سزای ئەوانە بدەن کە ناوبانگی پیشەکە ناشیرین دەکەن، کەسێکی خاوەن ئەزمون هەڵدەبژێرا، تا چاودێری موماریسەکان بکات‌و، چاو بخشێنێتەوە بە سکاڵاکاندا. ئەوەی زانراوە بابلیەکان لە مامەڵەکردن لەگەڵ پزیشکدا توندگیری زۆریان دەکرد. یاسای حمورابی کە لە ساڵەکانی (١٧٩٢-١٧٥٠)پ. ز. دانرابوو، چەند برگەیەکی پەیوەندی بە کرێی پزیشکەوە هەبوو، چەند ڕێسایەکیشی بۆ لێپرسینەوەی پزیشك دیاری کردبوو، لە ماددەی (٢١٨)ی یاساکەدا هاتووە: ( ئەگەر پزیشك چارەسەری برینی پیاوێکی ئازادی کردو بوو بە هۆی مردنی پیاوەکە، یان نەشتەرگەری چاوی بۆ کردو کەسەکە کوێربوو، دەستی پزیشکەکە دەبڕرێتەوە).

لە ماددەی (٢١٩)دا دەبێژێ: ( ئەگەر لە ئەنجامی چارەسەر کردنەوە کۆیلەی پیاوێکی هەژار مرد، دەبێت پزیشکەکە بە پێدانی کۆیلەیەك قەرەبوی خاوەنەکەی بکاتەوە).

لە ماددەی (٢٢٠)دا هاتووە: ئەگەر لە چارەسەر کردنی چاوی کۆیلەکەدا چاوی کوێربوو، پزیشکەکە پابەند دەکرێت نیوەی خوێنی مرۆڤێك بدات بە خاوەنەکەی). هەر لەو یاسایەدا کرێ‌و هەقدەستی پزیشك دیاری کراوە.

## سێیەم: بەرپرسیارێتی پزیشکیی لە سەردەمی گریکەکاندا:

لە سەردەمی گریکەکاندا پزیشکیی پێشکەوتنی بە خۆیەوە بینی، خواوەندی پزیشکی ناوی (سکولاپیۆس) بوو، هێماکەشی گۆچان‌و مارێك بوو، کە تا ئێستاش سیمبولی پیشەی پزیشکییە، پزیشکیی گریکی سوودی لە پزیشکیی میصری‌و بابلی وەرگرت، پزیشکیی گریکی لەسەر دەستی (ئەبوکرات) کە نازناوی (باوکی پزیشکیی) پێدرابوو لە

ئەفسانە ڕزگار کراو، کرا بە زانستێك لەسەر توێژینەوەو ئەزموون و بەدواداچوون ڕاوەستا، یەکەم کەس بوو باسی مۆراڵ و ئەخلاق و ئاکاری پیشەیی کرد، کە ئەمڕۆ بە شێوەی یاساو ڕێنمایی مافی پزیشك و نەخۆش دیاری دەکرێت، سوێندی پیشەیی داهێنا کە پابەندبوونێکی ئەدەبی بوو نەك یاسایی کە پێی دەوترێت (سوێندی ئەبوکرات)، لای گریکەکان هەموو کەسێکی ئازاد دەیتوانی مومارەسەی پیشەی پزیشکیی بکات، خوێندەواریش بە مەرج دانەنرابوو تەنیا لە شاری (ئەسینا) نەبێت بە مەرج دانرابوو هەرکەس کاری پزیشکی بکات دەبێت ئەندازەیەك خوێندەواری هەبێت، سزای پزیشکیی یان ماددی بوو یان ئەدەبی، بە شێوەیەکی گشتی سزاکەش ڕواڵەتی بوو.

## چوارەم: بەرپرسیارێتی پزیشکیی لە سەردەمی ڕۆمەکاندا:

ڕۆمەکان لە پزیشکیدا بە ناوبانگ بوون، چینی هەژارەکان پیشەی پزیشکیان دەکرد، ئازادەکان بە سوك سەیری پیشەی پزیشکیان دەکرد، بە هاتنی (جالینۆس) پێگەی پزیشکی بەرزو بڵند بوو، دوای (ئەبوکرات) گەورەترین پزیشك بوو، ڕۆمەکان نەخۆشخانەی گشتی و تایبەتیشیان دامەزراند... لە بارەی بەرپرسیارێتی پزیشك لەو سەردەمەدا، لەگەڵ پێشکەوتنی شارستانی ڕۆمەکان چەندین یاساش دەرچون، یەکێك لەو یاسایانە یاسای (ئۆکیلیا) بوو ساڵی ٢٨٧ پ.ز دەرچوو، بەپێی ئەو یاسایە هەرکەس زیانی گەیاند بە کەسێك بەرپرسیار دەبێت لەو زیانگەیاندنە، لە هەمان کاتدا جیاوازی ئەو زیانەیان دەکرد بەر سامان دەکەوت و، ئەوەش بەر جەستە دەکەوت، ساڵی (٨١)ی پ.ز یاسای (کۆرنیلیا) دەرچوو تایبەت بوو بە سزای کوشتنی بە ئەنقەست و کوشتن بە ژەهر، جێی سەرنجە دەقێکی تایبەت بە بەرپرسیاری تاوانی شارستانی نەبوو بەسەر پزیشکدا جێ بەجێ بکرێت، بەڵکو هەموو داواکان پشتی بە ڕێسا گشتیەکان دەبەست و، یاسای ئۆکیلیا و کۆرنیلیا پیادە دەکران بەسەر ئەو ڕوداوانەی لە چارەسەر کردنەوە ڕویان دەدا.

## پێنجەم: بەرپرسیارێتی پزیشکیی لە سەردەمی ئیسلامیدا:

شەریعەتی ئیسلام بایەخێکی گەورەی بە مرۆڤ داوە، بە تایبەت لە بواری پاراستنی لە نەخۆشی، بۆ ئەوەش چارەسەر کردن و تیمارکردنی بە ڕەوا داناوە، پێغەمبەر –درودی

خوای لێبێت- له فەرمودەیەکدا دەفەرموێ: ( ما أنزل الله داءً إلّا أنزل له شفاءً). رواه البخاري. واته: خوا هەر نەخۆشیەکی ناردبێت، چارەسەریشی بۆ ناردووە. دەبێت توێژینەوەی پزیشکیی بەردەوام بێت، تا کاری پزیشکیی پێشبخرێ‌و، نابێت کەس بە ناوی ئاییینەوە بڵێت چارەسەر وەرناگرم، کاری پزیشکیی بە _فەرزی کیفایە_ داناوە، واتە: ئەگەر لە شارێکدا پزیشك نەبێت هەموو خەڵکەکە تاوانبار دەبن. خۆپاراستن لە نەخۆشیە درمو گواستراوەکان دەفەرموێ: (إذا سمعتم الطاعون بأرض فلا تدخلوها، وإذا وقع بأرض وأنتم فيها فلا تخرجوا منها). رواه البخاري. واتە: ئەگەر زانیتان نەخۆشی چاوەقوڵە لە شوێنێك بڵاو بووەتەوە مەڕۆن بۆ ئەو شوێنە، ئەگەر لە شوێنێك بوون نەخۆشی چاوەقوڵەی تێدا بڵاو بوویەوە، ئەوشوێنە بەجێ مەهێڵن. ئەمە بەو مانایەیە کاتێك نەخۆشیەکی درمو پەتا بڵاو دەبێتەوە هاتوچوون‌و، تێکەڵاوی ڕابگرن، تا زیاتر ڕێگری بکەن لە تەنینەوەی نەخۆشیەکە. نابێت کەسی نەشارەزا خۆی بکات بە پزیشك‌و ژیانی خەڵك بخاتە مەترسیەوە، پێغەمبەر -دروردی خوای لێبێت- لە فەرمودەیەکی تردا دەفەرموێ: ( من تطبيب ولم يعرف الطب فهو ضامن). رواه ابوداود والترمذی وابن ماجه والحاكم واتە: هەرکەس کاری پزیشکیی کردو پزیشکیی نەدەزانی، دەستەبەری ئەو زیانانە دەکات کە بە نەخۆشەکەی دەگەیەنێت. بە گشتی پزیشکەکان دەکرێن بە دوو بەشەوە:

یەکەم: پزیشکی نەزان:

پزیشك ئەوکەسەیە پێکهاتەکانی لاشەی مرۆڤ‌و کاری ئەندامەکان‌و، نەخۆشیەکان‌و، هۆکارەکانیان‌و، نیشانەکانیان‌و، دەرمان‌و، چارەسەر کردنیان دەزانێت، هەرکەس ئەوانە نەزانێت نابێت چارەسەر بکات، ئەگەر زیانی بە نەخۆش گەیاند بەرپرسیار دەبێت‌و گرەنتی دەستەبەر کردنی قەرەبوو کردنەوەی دەکات. بەڵام ئەگەر نەخۆشەکە زانی کەسەکە ناشارەزایەو خۆی خستە بەردەستی خۆی بەرپرسیارە لە هەر زیانێك پێی دەگات.

دووەم: پزیشکی شارەزا:

پزیشکی شارەزا چارەسەری نەخۆشی کردو، هەڵەی نەکردو، کەمتەرخەمی نەکردو، نەخۆش ڕێی پێدابوو گرەنتی دەستەبەرکردنی ناکەوێتە ئەستۆ.

**له ئیسلامدا به چوار مەرج بەرپرسیارێتی ناکەوێتە ئەستۆی پزیشك:**

**١ – یاسادانەر (میری) مۆڵەتی پێدابێت.**

**٢ – نەخۆش ڕەزامەند بێت.**

**٣ – مەبەستەکەی چارەسەر کردن بێت.**

**٤ – پزیشك هەڵەی نەکردبێت.**

**سزا دانراوە بۆ ئەوەی کاری پزیشکیی دەکات ئەگەر زیانی بە نەخۆش گەیاند، ئەویش دەستەبەرکردن، یان ڕێگاپێنەدانی مومارەسە کردنی کاری پزیشکیی بوو، لە ساڵی ٣١٩ی کۆچیدا لە سەردەمی (عەباسی)یەکاندا لە شاری بەغدا پزیشکێك بە هەڵە چارەسەری نەخۆشێك دەکاتو، نەخۆشەکە دەمرێت، خەلیفە ( المقتدر بالله) فەرمانی دەرکرد بۆ (ابراهیم کوڕی بەتتحا) کە سەرۆکی گشتی چاودێری بوو، ڕێگانەدات هیچ پزیشکێك کاری پزیشکیی بکات تا لە لایەن (سینانی کوڕی سابت)ەوە تاقیکردنەوەی بۆ نەکرێت، بێجگە لە پزیشکە ناسراوو بە ناوبانگەکانی شاری بەغدا (٨٠٠) پزیشك تاقیکردنەوەیان بۆ کرا. ئەو پزیشکەش هەڵەکەی کردبوو سزادرا بە قەرەبوکردنەوەی خوێنی مردوەکەو، ڕێگانەدان بە مومارەسە کردنی کاری پزیشکیی. لێرەدا دوو شت بەرچاو دەکەوێت، یەکەم: لەو سەردەمەدا کاری پزیشکیی چەند بایەخی پێدراوە، دووەم: کاری پزیشکیی سیستەمی بۆ دانراوە، وەك تاقیکردنەوەو مۆڵەت پێدانو، بەرپرسیاریو سزادان، لایەنێکی دیکە شایانی باسە جیاوازیکردن بوو لە نێوان پزیشکی شارەزاو، پزیشکی نەشارەزا.**

**شەشەم: بەرپرسیارێتی پزیشکیی لە سەردەمی هاوچەرخدا:**

**لە چەرخی نوێدا کاری پزیشکی گەشەیەکی گەورەی کردووەو، پێشکەوتنێکی سەرسوڕهێنەری بەخۆیەوە بینیوە، پسپۆڕییە پزیشکییەکان لقو پۆی زۆریان لێ بووەتەوەو، ئەوانەش کاری پزیشکی دەکەن زۆرن، لەبەر ئەوە هەڵەی زۆریش ڕودەدات، بە ڕادەیەکە ترسو دڵەڕاوکێی بۆ زۆرێك لە یاساناسان دروستکرد، بۆیە نوسینەکانیان ئاڕاستەی بواری کاری پزیشکی کرد، وەك حوکمەکانی کاری پزیشکی چۆنبنو، چۆن چاودێری بکرێنو چ یاسایەك کۆنترۆڵی ئەم پیشە مرۆڤایەتیە بکات، بەشێوەیەك لە**

یەککاتدا کاری پزیشکی لە پێشکەوتن بەردەوامبێت و، ژیانی نەخۆشەکانیش لە هەڵەو دەستدرێژی پزیشکەکان پارێزراوبن. لە هەندێك لە وڵاتە پێشکەوتوەکاندا وەك فەرەنسا لقێکی نوێی یاسا داهێنرا بە ناوی (یاسای پزیشکیی)، هەندێك لە زانایانی بواری یاسا بوونی گرێبەستی پزیشکی لە نێوان نەخۆش و پزیشکدا بە پێویست دەزانن، هەندێك وڵاتیش دادگای تایبەتیان دامەزراند، تا کەیسەکانی هەڵەی پزیشکی لەبەردەم ئەو دادگایەدا یەکلا بکرێتەوە، مەبەستەکەشی بۆ ئەوەبوو پیشەی پزیشکی و ناوبانگی پزیشك پارێزراوبێت، بەم شێوەیە کاری پزیشکی لە پێشکەوتندایەو، هەڵەی پزیشکیش بەردەوامەو، یاساو سیستەمو رێنماییەکانیش لەبارەی بەرپرسیارێتی پزیشکییەوە بەردەوامن.

**حەوتەم: رێژەی هەڵەی پزیشکی لە ئاستی جیهاندا:** ( httpe/ www. Adelamer.com – httpe/ www. Alarabiya.net )

لە هەموو وڵاتانی جیهاندا هەڵەی پزیشکی ڕوودەدات، بەڵام ڕێژەکەی لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دیکە جیاوازە، لە هەر شوێنێك خزمەتگوزاری پزیشکی و چاودێری زۆرتر بێت ڕێژەی هەڵەکردن کەمتر دەبێتەوە.

بەڕێوبەری گشتی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی (دکتۆرە مارگرێت چان) ئاشکرای کرد لە هەموو جیهاندا ئەو هەڵانەی پەیوەندییان بە چاودێری تەندروستییەوە هەیە لە هەموو دە نەخۆش یەکێکیان بەردەکەوێت. لێکۆڵینەوە نێودەوڵەتییەکان ئەوەیان ئاشکرا کردووە لە (هەزار) نەشتەرگەریدا پزیشکەکان لە جەستەی (١٨) کەسیاندا ئامێریان لەبیر دەچێت و، لە (سەد هەزار) نەشتەرگەریدا بە هەڵە نەشتەرگەری لە ئەندامێکی دیکەی نەخۆشەکەدا دەکرێت، ئەمانەی خوارەوەش ڕێژەی هەندێك لەو هەڵە پزیشکیانەن:

١ – لە ئەردەن ئامارەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن سالآنە (٦٠) کەس قوربانی هە ڵەی پزیشکین، هۆکەیشی نەبوونی یاسایەکە لێپێچینەوە لە پزیشکان بکات.

٢ – ئامارەکانی وەزارەتی تەندروستی سعودیە دەڵێن ئەو کەیسانەی لە سالآنی ٢٠٠٤و ٢٠٠٥ خراونەتە بەردەست لیژنە پزیشکییە یاساییەکان (٨٩٦) کەیس بوون، لە (٤٢٨) کەیسیاندا بڕیاری تاوانبار کردن دەرچووە، لە (٨٤٨) پزیشکی داوا لەسەر کراودا (٢٩٩) پزیشکیان تاوانبار بوون.

٣ – له ئیسرائیل به هۆی هەڵەی پزیشکییەوە هەفتانە (٦٠) کەس دەمرێت، لە ٨٪ی ئەو نەخۆشانەی لە نەخۆشخانەکاندا دەخەوێنرێن لە کاتی چارەسەر کردندا توشی ڕوداوێکی نائاسایی دەبن کە پەیوەندی بە نەخۆشەکەوە نییە.

٤ – لە بەریتانیا بە هۆی هەڵەی پزیشکییەوە ساڵانە (سی هەزار) کەس دەمرن.

٥ – لە ئەمریکا بە هۆی هەڵەی پزیشکییەوە ساڵانە (سەد هەزار) کەس دەمرن، ساڵی ٢٠١٤ دوو توێژەری ئەمریکی لە کۆلێژی پزیشکی زانکۆی جۆنز هۆبکینز لە باڵتیمۆر، بە ناوەکانی (مارتن مەکاری، مایکڵ دانیاڵ) لە گۆڤاری (بریج مێدیکەڵ جۆرناڵ)دا ئەوەیان ئاشکرا کرد لە ئەمریکا بە هۆی هەڵەی پزیشکییەوە ساڵانە (دووسەدو پەنجا هەزار) کەس دەمرن، مردن بەهۆی هەڵەی پزیشکییەوە دوای نەخۆشییەکانی دڵ و شێرپەنجە، سێیەم هۆکاری مردنە.

بەپێی خەملاندنەکان ڕێژەی هەڵەکردن لە پێشکەش کردنی چارەسەری پزیشکیدا:

لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەگاتە لە ٤٪.

لە ئیسرائیل دەگاتە لە ٨٪.

لە دانیمارك دەگاتە لە ٩٪.

لە بەریتانیاو نەمساو یابان دەگاتە لە ١١٪.

تێچوی هەڵەی پزیشکی:

پەیمانگای توێژینەوەی پزیشکی سەر بە ئەکادیمیای ئەمریکی بۆ زانستەکان لە ساڵی ٢٠٠٢ ڕاپۆرتێکی لەسەر کێشەو هەڵەی پزیشکییەوە بڵاوکردەوە، بە هۆی هەڵەی پزیشکییەوە تێچوی ساڵانە لە ئەمریکا (١٧) ملیار دۆلارە

لە بەریتانیا (٧٣٠)ملیۆن جونەیهی ئیستەرلینی یە

لە ئیسرائیل (٦٦٠) ملیۆن شیکڵ، نزیکەی (١٦٣) ملیۆن دۆلارە.

# باسی دووەم

# بەرپرسیارێتی پزیشك لە هەڵەی ئەنجامدراودا

## لقی یەکەم

## ئەو هەڵانەی لایەنی مرۆڤانەی پزیشکیی دەگرنەوە

کاری پزیشکیی جۆرێکی تایبەتەو، لە پیشەکانی دیکەدا شێوەی نییەو، مومارەسەکردنێکی هونەریەو، ئامانجی خزمەتکردنی مرۆڤایەتیە، پزیشك شایانی ئەو متمانەیە کە نەخۆشەکەی پێی دەبەخشێت، بۆیە دەبێت ڕێزی نەخۆشەکەی بگرێت و، بایەخی تەواوی پێ بدات، بە چاوپۆشی لەوەی هەر ئایین و ڕەگەزو بیروبۆچوونێکی سیاسی هەیە، لەبەر ئەوەی پزیشك بە ویست و ئارەزوی خۆی ئەو پیشەی هەڵبژاردوە، بۆیە دەبێت پابەند بێت بە پرەنسیپ و ئاکارو نەریتەکانی پزیشکییەوە، کە لە پەنای خزمەتکردنی مرۆڤایەتیدا دەستکەوتی ماددی بەشێکی لاوەکییە، هەڵبژاردنی ئەم پیشە دەخوازێت ڕەفتارو هەڵسوکەوتەکانی نموونەی بەرزو باڵا بن و، لە کارەکەیدا شارەزا بێت و، هەموو توانای خۆی بە خەرج بدات و، کەسێکی خاکی و دلۆڤان و هۆشیارو هاوسەنگ بێت و، بە خێرایی و بەبێ ماندوبوون و سکاڵا دەربڕین فریای ئەو کەسانە بکەوێت کە پێویستیان بە یارمەتیدانی ئەو هەیە، دەبێت ڕواڵەت و ڕەفتارو هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتی لەگەڵ پلەو ڕێزی پیشەکەیدا گونجاو بێت.

مومارەسە کردنی کاری پزیشکیی بە تەنیا زانست و تەکنیك و شارەزایی پیشە نییە. بەڵکو بەشێکی گرنگی پێویستیە مرۆڤایەتیەکان لە خۆ دەگرێت، چونکە کاری پزیشك پەیوەندی بە جەستەی مرۆڤەوە هەیە کە جێی ڕێزەو، ناکرێت بە بێ ئامانجێکی ڕەوا دەستکاری بکرێت.

لە بەرامبەر هەڵەی هونەریدا کە لە ئەنجامی سەرپێچی کردنی بنەما پیشەیی و هونەریەکانەوە دروست دەبێت و، لە هەڵە کەسیەکانیەوە بەرپرسیارێتی شارستانی لێ دەکەوێتەوە، هەڵەی تریش هەن لە سەرپێچی کردنی ئەو ئەرکانە دروستدەبن کە لە ئەستۆیدایەو، بەستراوە بە کارە پزیشکیەکەیەوەو، لە ویژدانی مرۆڤانەیەوە هەڵدەقوڵێ.(٧٨)

**له خوارەوە لەسەر ئەو هەڵانە ئەدوێین پەیوەندیان بە لایەنی مرۆڤانەی پزیشکەوە هەیە:**

**یەکەم: هەڵەی بەرچاو ڕوونی نەدان بە نەخۆش:**

**کاتێك نەخۆشێك بۆ چارەسەر دەچێتە لای پزیشکێك، لەوانەیە بۆ دەستنیشان کردنی نەخۆشیەکەی بیخاتە بەردەم چەندین جۆری پشکنین، بۆیە پزیشك ناتوانێت بە بێ ڕەزامەندی نەخۆش هیچ کارێکی پزیشکیی ئەنجام بدات، کەواتە دەبێت بەرچاوڕوونی بدات بە نەخۆش لە بارەی مەترسیەکانی نەخۆشیەکەی‌و، ئەو چارەسەرەی بە نیازە بۆی بکات، ئەوکات نەخۆش بە بەرچاو ڕوونی‌و ئاگاداریەوە بڕیار ئەدات چارەسەری بۆ بکرێت، یان نەکرێت [٩٧].**

**ڕاگەیاندنی ڕاستیەکانی نەخۆشی‌و چارەسەرەکەی بە شێوەیەکی زانستی‌و مرۆڤ دۆستانە بێت. وەك:**

**١ – سروشتی ئەو مەترسیەی توشی نەخۆش دەبێت، چەندە پێویستە پەلەی تێدا بکرێت، باری دەروونی نەخۆشەکە چۆنە؟ ئاسەوارو ئەنجامی چارەسەرەکە چی دەبێت؟ ئەگەر چارەسەری بەکارنەهێنا ئەڵتەرناتیڤ چی یە؟**

**٢ – دەبێت باری دەروونی نەخۆش ڕەچاو بکات‌و، بە نەرمونیانی لەگەڵیدا ئاخاوتن بکات‌و. ئارامی‌و ئۆقرەیی بخاتە دڵی نەخۆشەکەوە.**

**٣ – دەبێت دەستەواژەی ڕوون‌و ئاسان بەکاربێنێ، تا نەخۆش لێی تێ بگات.**

**٤ – دەبێت ڕەوشی تەندروستی نەخۆش لە بەرچاو بگرێت، بە تایبەت لە کاتی چاوەڕوانکردنی مردنی نەخۆشەکە، باشتر وایە خێزانی نەخۆشەکە ئاگادار بکاتەوە، مەگەر نەخۆشەکە ڕازی نەبێت [٨٠].**

**ئاگادار کردن‌و بەرچاو ڕوونی پێدان بە نەخۆش لە بارەی نەخۆشیەکەیەوە‌و، ئەو ئەنجامەی لێی دەکەوێتەوە لە لایەکەوە دیاردەیەکە لە دیاردەکانی ڕێزگرتنی مرۆڤایەتی نەخۆش‌و، لە لایەکی دیکەوە هاوسەنگی نێوان پیشەیی‌و بەکاربەر بەدی دێنێ، بەڵام لە گرێبەستی پزیشکیدا سەرەڕای پاراستنی هاوسەنگی، وەك وریا کردنەوەیەکی پێشوەختی ئەو مەترسی‌و سودانەیە چاوەڕوان دەکرێت لە چارەسەرەکە بکەوێتەوە.**

لەبەر گرنگی بەرچاوڕونیدان لە کاری پزیشکیدا (قەزای) دادوەریی فەرەنسی بایەخێکی تایبەتی پێ داوە، دادگای تێهەڵچونەوەی (لیۆن) دووپاتی ئەوەی کردوەتەوە پێش ئەوەی پزیشك هیچ دەست تێوەردانێکی چارەسەر کردن بکات پابەندە بە ئاگادار کردنەوەی نەخۆش لە ڕەوشی نەخۆشیەکەیو، ئەو ئەنجامەی لە چارەسەر کردنەکەوە بەدەست دێو، ڕەزامەندی بەرچاوڕونی بەدەست بێنێ.[٨١]

ئەگەرچی یاسادانەری عێراقی نەچووە بەلای بەرچاوڕون کردنی نەخۆشدا، ئەوەش لە خۆیدا درێغیو کەموکورتی یە لە یاسای تەندروستی عێراقدا، بەڵام بڕیارەکانی دادوەریی دادگای پێداچوونەوەی عێراق ڕای دادوەریی لەم بارەوە ڕووندەکاتەوە،

بڕیاری پێداچوونەوەی ژمارە ( ٧٩٤/٤٥٠م ) لە ٢٠٠١/٥/١٣ دەڵێ: ﴿ پەسەند کردنی داوای قەرەبوو کردنەوەی ئەو خانمەی سکاڵای دژی پزیشکەکەی بەرزکردوەتەوە، چونکە زانیاری پێ نەداوە لەوەی نەخۆشیەکەی کاریگەریی لەسەر کۆرپەکەی دەبێتو، نەخۆشیەکەی دەگوێزرێتەوە بۆ کۆرپەکەیو، مناڵەکەش بە شێواوی لەدایك بوو، ئەوەش هەلی بڕیاردانی لە باربردنی کۆرپەلە شێواوەکەی لە دەست داوە، کۆرپەکەش پاش چەند خولەکێك لە دایکبوونی مرد﴾.[٨٢]

لە بڕیاری ژمارە (٤١٧/م١ گواستراوە/٢٠٠١) لە ٢٠٠١/٥/١٢ هەمان شت دوویات دەکاتەوە، دەڵێ: ﴿ ئەگەر پزیشك نەخۆشەکەی ئاگادار نەکردەوە لەوەی پاش نەشتەرگەری چۆن خۆی لە ئاسەوارە لاوەکیەکانی نەخۆشیەکە بپارێزێت، ئەوە بەرپرسیارێتی دەکەوێتە ئەستۆی پزیشك﴾.[٨٣]

لێرەدا بڕیاری دادوەریی بەرچاوڕوونی نەدانی بە هەڵە داناوەو، بەرپرسیارێتی خستووەتە ئەستۆی پزیشکەوە.

لە ڕێنمایەکانی ڕەفتاری پزیشکیدا دەڵێ: لەم بارانەدا پزیشك بەرپرسیارە: بەرپرسیارێتی لە ئاگادار کردنەوە لە مەترسیو سەرەنجامی نەخۆشیەکە، پزیشك بەرپرسیارێتی هەڵەی دەکەوێتە ئەستۆ ئەگەر نەخۆشەکەی لە مەترسی نەخۆشیەکەی ئاگادار نەکردەوە، مەگەر بسەلمێ لە کاتی ئاگادار کردنەوەدا نەخۆشەکە کارێکی ناپەسەند دەکات، یان زیان بە بەرژەوەندی کەسانی دیکە دەگەیەنێت. ڕێنمایەکانیش بەرچاوڕنی پێدانی نەخۆشی کردوەتە ئەرکی پزیشكو ئاگادار نەکردنەوەی بە هەڵە

داناوە، لەو کاتەدا نەبێت نەخۆشەکە کارێکی ناپەسەند بکات، یان زیان لە بەرژەوەندی کەسانی تر بدات.

**دووەم: هەڵەی ڕەزامەندی وەرنەگرتنی نەخۆش:**

بۆ دەست بەکاربوونی پزیشك لە کارەکەیدا، ڕەزامەندی وەرگرتنی نەخۆش مەرجێکی بنەڕەتی یە، هەموو کارێك بە بێ وەرگرتنی ڕەزامەندی نەخۆش یان نوێنەرەکەی بە دەستدرێژی دادەنرێت بۆ سەر نەخۆش. یاسا نێودەوڵەتییەکان مافیان بە مرۆڤ داوە کەس نەتوانێت دەستدرێژی بکاتە سەر جەستەی ، چونکە ماف تایبەتی کەسەکەیە ، لەوانەش کۆنگرەی نێودەوڵەتی بۆ مافەکانی مرۆڤ کە لە ٢٢ی نیسان تا ١٣ی ئایاری ساڵی ١٩٦٨ لە تاران گرێدراو، کۆنگرەی کۆمەڵەی نێودەوڵەتی سزاکان لە ئەیلوولی ١٩٧٨ لە هامبورگ لە ئەڵمانیا گرێدرا تایبەت بوون بە ڕێزگرتنی ماف مرۆڤ . بڕیاری یانزەهەمی کۆنگرەی تاران ئامانجی پاراستنی ماف مرۆڤ بوو لە ژیانی تایبەتی خۆیدا، بە تایبەت پاش زۆربوونی ئەو مەترسییانەی بە هۆی پێشکەوتنی زانستی و تەکنەلۆژیاوە دروست بوون. (٨٤)

لە پرۆژەی ڕەفتاری پیشەیی پزیشکیی عێراقی لە بەندی چوارەم/ بڕگەی٣ دەڵێ: ﴿ لە کاتی پێویستبونی دەستێوەردانی نەشتەرگەری بۆ چارەسەرکردن ... پێویستە ڕەزامەندی نەخۆشی هۆشیاری پێگەشتوو لە بارەی نەشتەرگەریەکەوە بە نوسراویی لەسەر پەڕاوێکدا وەرگیرابێت. (٨٥). ڕێنمایەکانی ڕەفتاری پیشەی پزیشکی بڵاوکراوەی ئەنجومەنی سەندیکای پزیشکان پشت بەستو بە حوکمی ماددەی (١/٢٢)ی یاسای ژمارە (٨١)ی ساڵی ١٩٨٤ی سەندیکای پزیشکان دەڵێ: ( خۆبواردن نییە لە ڕەزامەندی وەرگرتنی نەخۆش کاتێك توانای دەربڕینی ڕەزامەندی هەبێت، پزیشك بۆی نییە تەحەدای ئارەزوی نەخۆش بکات ...).

یاسای سزادانی عێراقی ژمارە (١١١)ی ساڵی ١٩٦٩ لە ماددەی (٤١) دا دەڵێت :{ئەگەر کردارێك کراو بەکارهێنانی ماف بوو بەپێی یاسا بە تاوان دانانرێت ، ئەمەش بە بەکارهێنانی ماف دادەنرێت: پرۆسەی نەشتەرگەری و چارەسەر کردن لەسەر بنەمای هونەری بێتو بە ڕەزامەندی نەخۆش یان نوێنەرە یاساییەکەی ئەنجام بدرێت، یان بە بێ ڕەزامەندی ئەوان لە کاتی ناچاریو پەلەدا}. دەبێت ڕەزامەندی دەربڕینەکەش بە

بەرچاوڕوونییەوە بێت بەوەی نەخۆشەکە ڕەوشی تەندروستی خۆی بزانێت‌و، بشزانێت چ کارێکی پزیشکی بۆ ئەنجام دەدرێت‌و، ئەنجامەکەشی چی دەبێت .

لە چوارەمی – ب –ی ماددەی (٩١)ی یاسای تەندروستی گشتی ژمارە ( ٨٩) ساڵی ١٩٨١ی هەموارکراودا دەڵێ: ﴿ نابێت بەبێ ڕەزامەندی وەرگرتنی خودی نەخۆش – ئەگەر هۆشیار بێت– هیچ نەشتەرگەریەکی بۆ بکرێت، ئەگەر نەخۆشەکە بێهۆش بوو، یان ناکام بوو ڕەزامەندی خزمێکی وەردەگیرێت، بەڵام ئەگەر باری ژیانی نەخۆشەکە لە مەترسی مردندا بێت، بۆ ڕزگارکردنی ژیانی نەخۆشەکە بەبێ وەرگرتنی ڕەزامەندی نەشتەرگەری بۆ دەکرێت.

د.عادل علی المقدادی وایدەبینێت دەکرێت پزیشك لە بەدەستهێنانی ڕەزامەندی نەخۆش‌و کەسوکاری ببەخشرێت‌و، هەڵسوکەوتەکەشی بە هەڵە دانەنرێت ئەگەر ڕەوشی نەخۆشەکە مەترسیدارو بەپەلە بێت، بە مەرجێك حاڵەتی نەخۆشەکە دواخستن هەڵنەگرێت .ئەگەرچی بنچینەیەکی گشتی ڕەزامەندی وەرگرتنی نەخۆش یان ڕەزامەندی کەسوکارەکەی پێویستە ، بەڵام لە هەندێك باردا ڕەزامەندی وەرگرتن پێویست نییە وەك : ڕێکاری خۆپاراستنی تەندروستی‌و، کوتان‌و، ڤاکسینی تەوزیمی ، یان لەو بارانەدا بەرژەوەندی گشتی دەیخوازێت، وەك نەخۆشیە درمەکان، کە بڵاوبونەوەیان هەڕەشەن بۆسەر کۆمەڵگەو تەندروستی گشتی، لەبەر ئەوەی بەرژەوەندیەکی ڕەوای کۆمەڵگەی تێدایە، پزیشك دەتوانێت نەخۆش ناچار بکات چارەسەر وەربگرێت، یان هۆکاری خۆپاراستن بەکاربێنێ.[٨٦]

یاسای شارستانی عێراقی ژمارە (٤٠)ی ساڵی ١٩٥١ی هەموارکراو، لە ماددەی (٢١٢)دا دەڵێ: ﴿پێویستیەکان قەدەغەکراوەکان حەڵاڵ دەکەن، بەڵام بە ئەندازەی پێویستیەکە﴾. بەپێی ئەم دەقە لە کاتی پێویستدا پزیشك دەتوانێت بە بێ ڕەزامەندی وەرگرتنی نەخۆش‌و نوێنەرەکەی کاری پزیشکیی ئەنجام بدات، وەك: کەسەکە بورابێتەوە لە ڕوداوی هاتوچۆو، برینداری‌و، کەسیشی لەگەڵ نەبێت.

ئەم چوار فۆرمەی خوارەوە نموونەی فۆرمی ڕەزامەندی وەرگرتنی نەخۆشن‌و، لەبەر ئەوەی مافی نەخۆشی تێدا ڕەچاو نەکراوە تێبینیمان لەسەری هەیە، بۆیە ڕونکردنەوەیەکیان لەسەر دەدەین:

نەخۆشخانەی سلێمانی فێرکاری

## فۆرمی ئەنجامدانی کاری بێهۆشکاری و نەشتەرگەری

## پەسەندکراوی پێ ڕاگەیەنراو

بەروار ......./....../....۲۰۱

منو کەسوکارم کە ناو واژۆمان لە خوارەوە هاتووە ڕازین بە ئەنجامدانی کاری نەشتەرگەری لەلایەن د.(                ) هەروەها وەرگرتنی بێهۆشکاری( بەنج ) لە لایەن د.(                ) .

وە ئەم خاڵانەی خوارەوەمان بۆ ڕوون کرایەوە بەباشی لێی تێگەیشتن بۆیە لە خوارەوە واژۆمان کرد :-

جۆری نەشتەرگەری(                              ) وەیان هەرکارێکی تری نەشتەرگەری کە پێویست بێت بکرێت وەیان بانگکردنی هەر پزیشکێکی تر لە پسپۆڕی جیاوازدا کە پێویست بکات داوابکرێت بۆ کاری نەشتەرگەری چاوەڕوان نەکراو.

کاری نەوازەی بێهۆشیو نەشتەرگەری لەکاتی نەشتەرگەرییەکە یان دواتر ڕوویدات وەکو :

مردن، بێدار نەبوونەوە لە بەنج، وەستانی دڵ، نۆرە دڵو مێشك، نیوە ئیفلیجی، فرە هەستیاری بە دەرمانەکان، خوێن بەربوون، هەوکردن، خرا پتربونو سەرنەکەوتنی نەشتەرگەریەکەو هەرکارێکی نەوازەی تر کەلێرەدا نەنوسراوەو لەوانەیە ڕووبدات.

تێبینی :-

| ناووواژۆی نەخۆش | ناووواژۆی بەخێوکەر | ناو و واژۆی پ. بێهۆشکار | ناووواژۆی پ. نەشتەرگەری |
|---|---|---|---|
| | | | |

فۆرمی ژمارە ( ۱ )

نەخۆشخانەی هەولێری فێرکاری

## فۆرمی رەزامەندی نەشتەرگەری

من ........................ واژۆم کرد لە ژێرەوە رازیم لەسەر نەشتەرگەری لە لایەنی پزیشك ............ وەرازیم بە پێدانی (بەنج) لە لایەنی پزیشکی سرکەر ........................
وەرازیم لەسەر هەر شتێك روبدات لە کاتی نەشتەرگەری یان بانگ کردنی هەر دکتۆرێکی تر بۆ تەواوکردنی نەشتەرگەری یەکە وەرازیم لەسەر هەر دەرهاوێشتەیەك (مضاعفات) پێشبینی دەکرێت لە کاتی نەشتەرگەری و دوای نەشتەرگەری روبدات وە داوام لەسەر هیچ کەسێك نابێت بۆیە لە ژێرەوە واژۆم کردوە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| نەخۆش | کەسی یەکەمی نەخۆش | پەرستیار | پزیشك |

فۆرمی ژمارە (٢)

# فۆرمی نەخۆشخانەیەکی ئەهلی لە سلێمانی

ژمارە:

ناوی نەخۆش ........................ ژمارەی ژوور ...............

تەمەن ..................... بەرواری نوستن ...................

پیشە ................. بەرواری دەرچوون ..................

ناونیشان ..................... پزیشکی لێپرسراو .............

ناونیشانی نزیکترین کەس ..................

ژمارەی تەلەفۆن:

ژمارەی مۆبایل:

---

رەزامەندی نەخۆش بۆ ئەنجامدانی نەشتەرگەری

من کە ناوم(　　　　) رەزامەندی خۆم نیشان دەدەم کە پزیشکی پسپۆری نەشتەرگەری د...... هەڵسێت بە ئەنجامدانی نەشتەرگەری ....... لەگەڵ هەموو ئەو پێداویستییانەی بە باشی دەزانێت وە هەروەها هێنانی هەر پزیشکێکی تر بەرێزیان دیاری دەکات. وە رەزامەندی خۆم نیشان دەدەم کە پزیشکی بێهۆشکاری پسپۆر...هەڵسێت بە ئەنجامدانی کاری بێهۆشکاری گشتی وە پەسەندی ئەم کێشانەی خوارەوە هەمووی دەکەم، وە ئەو نووسراوەم خوێندەوە لە خوارەوە بە پەنجەمۆر یان واژوومان کردووە .

هەڵنەستانەوە لە بەنجی گشتی، مردن، جەڵتەی دڵ یان دەماخ، تۆپەڵبوونی خوێن لە سییەکان یا لە ناو دەماخ بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن وە بەربوونی دەماری خوێنی مێشك، دەرکەوتنی هەندێك نەخۆشی دوای ئەنجامدانی کاری بێهۆشکاری، بەربوونی خوێن، هەوکردن، چاك نەبوونەوە بەرەو خراپتر بوون، وە هەموو ئاکامەکانی نەشتەرگەری و بێهۆشکاری لەناو هۆڵی نەشتەرگەری و دوای چوونی نەخۆش بۆ قاوش.

پەرستاری لێپرسراو.....　　　　واژووی نەخۆش　　　　لێپرسراوی نەخۆش

ناو:　　　　ناو:　　　　ناو:

فۆرمی ژمارە (٣)

## فۆڕمی ڕەزامەندی نەشتەرگەری/ وەزارەتی تەندروستی

من هاوڵاتی(                ) دوای خوێندنەوەی ئەو بەڵێننامەیە ڕەزامەندی دەردەبڕم بە ئەنجامدانی نەشتەرگەری (      ) لەلایەن پسپۆڕی نەشتەرگەر(                ) هەروەها ڕازیم لەسەر پێدانی سڕکردن لەلایەن پزیشکی پسپۆڕی سڕکردن(                ).

ڕەزامەندی دەردەبڕم کە:-

١ من ئاگاداری تەواوی نەخۆشیەکەم هەموو ڕێگاکانی چارەسەری نەخۆشیەکە بەنەشتەرگەری بۆم ڕوونکراوەتەوە.

٢ پزیشکی نەشتەرگەری بۆی هەیە هەر نەشتەرگەریەکی تر ئەنجام بدات کە بەپێویستی دەزانێ بۆ سەرکەوتنی نەشتەرگەریەکە (لە کاتی پێویستدا و لەبەرژەوەندی نەخۆشەکە)

٣ پزیشکی نەشتەرگەری بۆی هەیەلەکاتیپێویست پزیشکێکی ترداوابکا بۆئەنجامدانی نەشتەرگەریەکە بەپێی پسپۆڕی پلە بەندییەکەی.

٤- لەنەشتەرگەری هەناوبینی(ناظور) بۆی هەیە نەشتەرگەریەکە بگۆڕێت بۆ کرانەوە(فتح)ئەگەر پێویست بوو.

٥ لەوانەیە ماکە گشتیەکان ڕووبدات تایبەت بە(نەشتەرگەر و سڕکردن).

ا پرۆسەی نەشتەرگەری (ماکە گشتی یەکانی نەشتەرگەری)

(خوێنبەربوون-هەوکردن لەجێی نەشتەرگەری یان ناوچەی تری جەستە-بەدەست نەهێنانی ئامانجە خوازراوەکانی نەشتەرگەری دابەزینی پەستانی خوێن پێویستی بەپێدانی خوێن-ژان لەشوێنی نەشتەرگەریەکە-گیان لەدەس دان-نەستوربونی پێ(خوێن مەین) ).

ب سڕکردن و بێ هۆشکردن (ماکە گشتی یەکان)

(هەستیاری لەدەرمانەکان-دواکەوتنی بەخۆهاتنەوە-توشبون بەجەڵتەی مێشک یان دڵ-توشبون بەتای سەخت-توشبون بەئیفلیجی یان زیانی دەماری-پێویستی بەئامێری هەناسەی دەسکردوچاودێری جر-گیان لەدەستدان).

ج- هەموو ئەو ماکانەی باسکران ئەگەری ڕودانی هەیە لەسڕکردنی شوێنی(بەنج مەوزوعی). ماکە تایبەتەکان لە لایەن پزیشکی پسپۆڕبۆم ڕونکراوەتەوەو واژۆ لەسەر ئەم فۆرمە ناکەم ئەگەر لەهەموو ماکەکان ڕەزامەندیم نەدابێت.

لەوانەیە پێویستیم بەوەرگرتنی خوێن هەبێت‌و ماکەکانی وەکو هەستیاری ڕووبدات.

کاتی تەواویان پێ بەخشیم بۆ پرسیار و ڕوونکردنەوە بۆیە لە خوارەوە واژۆ دەکەم.

لەکاتی ئەنجام دانی نەشتەرگەری بۆ قاصروبێرکۆڵەکان کەسی پلەیەك بۆیهەیە واژۆلەبری نەخۆش بکا

بەلام ماکەکانی نەشتەرگەریەکە دەبێت بەهۆی پشت گوێ نەخستن‌و کەمتەرخەمی نەبێت.

هەرنەخۆشێك گیان لەدەست بدات لەکاتی نەشتەرگەری دەبێت بچێتە پزیشکی دادوەری بۆوەرگرتنی ڕاپۆرتی پزیشکی.

پەنجەمۆر واژوی نەخۆش یان کەسی پلەیەکی نەخۆش          پەرستاری ڤاوش

پزیشکی نەشتەرگەری          پزیشکی سڕکار

فۆرمی ژمارە٤ ( فۆرمی پێشنیار کراوی وەزارەتی تەندروستی )

**سێیەم: سەرنج لەسەر فۆرمی ڕەزامەندی وەرگرتن:**

بەڵێ زۆرینەی فەقیهە یاساییەکان لەسەر ئەوە ڕێکن کاری پزیشکی هەوڵو توانا بەخەرجدانە (بذل العناية) نەك بە ئەنجام گەیاندن، بۆیە مەرج نیە هەرکەس ڕۆشتە نەخۆشخانە دەبێت بە ساغی بگەڕێتەوە، لە هەمانکاتدا مانای ئەوە نیە هیچ بەرپرسیاریەك ناکەوێتە ئەستۆی پزیشك، بەڵام هەندێك لە کارە پزیشکیەکان (تحقيق النتيجة)ی لێ دەخوازرێ، واتە لە هەندێك لە کارە پزیشکیەکاندا وەك سڕکردن یەکێك لە کارە پزیشکیەکانە گریمانەی هەڵە کردن تیایدا دیاری کراوو سنورداره، بۆیە نابێت هەڵەی تێدا بکرێت، بەڵکو دەبێت کارەکە بە ئەنجام بگات، پزیشکی بەنج چۆن نەخۆش سڕ دەکات دەبێت بە ئاگایشی بێنێتەوە، خۆ ئەگەر نەخۆش هەستیاری بە دەرمانێك هەبوو نابێت بۆی بەکار بهێنێت، هەموو زیانگەیاندنێك بە نەخۆش بەرپرسیارێتی بۆ پزیشك دروست دەکات مەگەر بیسەلمێنێ کە بە هۆی دەرەکیەوە بووە، بە سەرنجدان لەم فۆرمانەی سەرەوە دەبینرێت مافی نەخۆش لە سێ فۆرمی یەکەمدا پێشێل کراوە، چونکە بە شێوەیەکی ڕەها پزیشکی لە هەموو پابەندبوونێك بەخشیوە، هیچ بەرپرسیاریەتیەکی نەخستووەتە ئەستۆی پزیشك ئەگەر زیانیش بە نەخۆش بگەیەنێت، لە فۆرمی چوارەمیشدا تەنیا ئەوەی جیاوازە دەڵێ: ماکەکانی نەشتەرگەریەکە دەبێت بە هۆی پشت گوێ خستنو کەمتەرخەمی نەبێت، ئەگەر ئەمە بۆ پزیشکی نەشتەرکار گونجاوبێت ئەوە بۆ پزیشکی بەنج نەگونجاوە، چونکە کاری پزیشکی بەنج بە ئەنجام گەیاندنە. بۆیە باشتر وایە گۆڕانکاری لە فۆرمەکاندا دروست بکرێت، چونکە گرێبەستەکان بە شێوەیەکی گشتی دەبێت لەسەر بناغەی هاوسەنگی نێوان لایەنەکان دروست ببێت، تا هیچیان ملکەچی ئەویتریان نەبێت، بەڵام لە گرێبەستی چارەسەرکردنی پزیشکیدا ئەو هاوسەنگیە نایەتەدی، ئەم گرێبەستە دوو کەموکورتی (عيب)ی تێدایە،

یەکەمیان: (إكراه) ناچاربوون: نەخۆش بە ناچاری ئەو فۆرمە واژۆ دەکات، چونکە ئەگەر واژۆی نەکات نەشتەرگەری بۆ ئەنجام نادرێ، ئەوەش ترسێکی دەروونی بۆ نەخۆش دروست دەکاتو، هەست بەوە دەکات ئەگەر نەشتەرگەریەکەی بۆ نەکرێت ڕووبەڕووی مەترسی ژیان دەبێتەوەو، لە پێناو چارەسەر کردنەکەدا ڕەزامەند دەبێتو، واژۆ دەکات.

دووەمیان: (استغلال) فرسەت قۆستنەوە: ئەمەش عەیبێکی دیکەی گرێبەستەکەیە، ئیستغلال کردنی پێویستیەکانو لاوازی پێگەی نەخۆشە، ئەمەش یەکێکە لە عەیبەکانی

نیرادەو، کەموکورتی لە گرێبەستەکەدا دروست دەکات. بۆیە پێویستە لە فۆرمەکەدا بەرپرسیارێتی پزیشکی نەشتەرکارو پزیشکی سڕکردن جیا بکرێنەوە، چونکە کاری یەکەمیان هەوڵدانە (بذل العناية)، بەڵام ئەرکی دووەمیان بەئەنجام گەیاندنە (تحقيق النتيجة).

## لقی دووەم

## ئەو هەڵانەی لایەنی هونەری کاری پزیشکی دەگرنەوە

### یەکەم: هەڵەکردن لە پشکنیندا:

پشکنینی پزیشکیی دەستپێکی کاری پزیشکییە، سەرەتا بە پشکنینی ڕواڵەتیی کلینیکی دەست پێ دەکات، بە سەرنجدان لە نیشانە دەرەکیەکان وەك: ڕواڵەتی دەرەوەی نەخۆش، لەوانەیە لێرەدا پزیشك چەند ئامێرێکی سادە بەکار بێنێ وەك: بیستۆکی پزیشکیی و، ئامێری پێوانی فشاری خوێن و، ئامێری هێڵکاری دڵ و، ئامێری دیاریکردنی ڕێژەی شەکر لە خوێندا، ئەندامەکانی هەستیشی وەك: دەست و چاوو گوێ بەکاربێنێ، ئامانجی ئەم پشکنینە سەرەتاییە دڵنیا بوونە لە ساخ کردنەوەی بوونی ئەو نیشانەو دیاردەو بەڵگانەی یارمەتی دەستنیشان کردنی ئەو نەخۆشیە دەدەن کە نەخۆش پێوەی دەناڵێنێ. [٨٧]

### پشکنینی پزیشکیی بە دوو قۆناغدا تێدەپەڕێ:

١ – قۆناغی پشکنینی سەرەتایی: بە پشکنینی کلینیکی و ڕواڵەتی دەستپێدەکات، وەك بەکارهێنانی ئەندامەکانی هەست و، هەندێك ئامێری سادەی وەك: ئامێرەکانی پێوانی فشاری خوێن و، پێوانی ڕێژەی شەکرو، تەرمۆمەتری پێوانی گەرمی لەش. پێش ئەوەی هیچ چارەسەرێکی پزیشکیی و نەشتەرگەری بەکاربێت، پشکنینی سەرەتایی نەخۆش هەنگاوێکی پێویستە.

٢ – قۆناغی پشکنینی تەواوکاریی: لەم قۆناغەدا پزیشك ئامێرە وردو پێشکەوتووەکان بەکاردێنێ، وەك: ئامێرەکانی ئیکۆو هەناوبینی و سۆنارو تیشکی سەروودەنگ و، شیکاری خوێن و هێڵکاری مێشك... هتد، تا بتوانێت بە وردی و دروستی دەستنیشانی

نەخۆشیەکە بکات.[88]. ئامانجی پزیشك گەشتنە بە ئەنجامێکی لۆژیکی، تابتوانێت لە نێوان چەندین نەخۆشی جۆراوجۆردا نەخۆشیەکە دیاریو دەستنیشان بکات، لێرەدا دەردەکەوێت پشکنینی سەرەتایی جیاوازە لە دەستنیشان کردنی نەخۆشی، چونکە پشکنین بریتی یە لە ساخ کردنەوەو، دڵنیابوون لە دەرکەوتنو بوونی بەڵگەو دیاردەیەکی دیاریکراوو، لەوانەشە نەگات بە هیچ ئەنجامێك، بەڵام دەستنیشان کردن دڵنیابوونە لە نەخۆشیەکی دیاریکراو.[89].

ئەگەر پزیشك پێش هەر پرۆسەیەکی چارەسەرکردنو نەشتەرگەری پشکنینە سەرەتایەکانی نەکرد، ئەوە بە کەمتەرخەم دادەنرێتو، لەوانەیە بەرپرسیارێتی لێ بکەوێتەوە.

قەزای فەرەنسی لەسەر ئەوە جێگیر بووە، ئەنجام نەدانی پشکنینی سەرەتایی بۆ نەخۆش پێش پرۆسەی نەشتەرگەری یان چارەسەرکردن، بە کەمتەرخەمی دادەنرێتو، هەڵەی پشکنینی لێ دەکەوێتەوە.[90].

دووەم: هەڵەکردن لە دەستنیشان کردنی نەخۆشیدا:

دەستنیشان کردنی نەخۆشیی: ( بریتی یە لە دیاریکردنی سروشتو سیفاتو هۆکاری نەخۆشیەکە).[91].

دەستنیشان کردنی نەخۆشی: ( بریتیە لە باسو لێکۆڵینەوە لەو نەخۆشیەی نەخۆش بە دەستیەوە دەناڵێنێ، نەخۆش، تا بتوانێ بگات بە ڕاستیی نەخۆشیەکەو دیاری بکات.[92].

دەستنیشان کردنی نەخۆشی پرۆسەیەکی فیکریە، نیشانەکان دیاری دەکرێنو ڕێکدەخرێنو، لەتەك نیشانەکانی تردا بەراورد دەکرێن، تا بزانرێت ئەو نەخۆشیەی نەخۆش پێوەی دەناڵێنێ چییە؟ دەستنیشان کردنی نەخۆشیی لە پوختەو کاکڵەی کاری پزیشکییو، جێبەجێ کردنی گرێبەستی چارەسەر کردنی پزیشکیە، پزیشك پێش ئەوەی چارەسەری نەخۆش بکات، یان کاری نەشتەرگەری بکات، جۆری ئەو دەردە دیاریو دەستنیشان دەکات کە نەخۆش پێوەی دەناڵێنێ، چونکە دەستنیشان کردنی نەخۆشیی کاریگەریەکی گرنگی هەیە بۆ ئەنجامی چارەسەر کردنو، نەشتەرگەری، ئەم

قۆناغه -قۆناغی دەستنیشان کردنی نەخۆشیی- لایەنێکی وردو گرنگی پەیوەندی نێوان پزیشکو نەخۆشە، چونکە هەر هەڵەیەکی تێدا بکرێت، دەشکێتەوە بەسەر چارەسەر کردنو، نەشتەرگەریەکەدا. [٩٣].

دەستنیشان کردنی نەخۆشی پایەی بنەڕەتی پرۆسەی چارەسەر کردنە، چونکە دەکەوێتە پێش قۆناغی چارەسەر کردنو، گرنگیەکی تایبەتی هەیە، لەم قۆناغەدا پزیشك هەوڵ دەدات بزانێت ناوەڕۆکی نەخۆشیەکە چی یەو، چەندە مەترسیدارەو، کەی سەری هەڵداوەو، چۆن تەشەنەی کردووەو فراوان بووەو، کاریگەری بۆماوەیی‌و دەروونی چەند کاریگەرەو، نیشانەکانی چین؟. [٩٤].

هەموو هەنگاوەکانی دواتر بەستراون بەم هەنگاوەوەو، ئەنجامی دوایش لەسەر دەستنیشان کردن بڕیاری لەسەر دەدرێتو، هەر هەڵەکردنێك تیایدا هەموو کارەکانی دواتر دەخاتە هەڵەوەو، بە لارێدای دەبات، بۆیە پێویستە پزیشك لەم قۆناغەدا زۆر وریابێتو، وردەکاری بکاتو، هەرچی توانای زانستی هەیە بە کاری بێنێت [٩٥].

١ - راوێژ کردن بە کەسانی تر:

لە بنەڕەتدا پزیشك پابەند نییە ڕاوێژ بە پزیشکێکی دیکە بکات، ئەگەرچی شارەزاتریش بێت، بەڵام لە هەندێك کاتدا لە دەستنیشان کردنی نەخۆشیدا تێکەڵاویەك دروست دەبێت، ئەوەش زۆر جار بە هۆی لەیەکچونی نیشانەکانی نەخۆشیەکانەوە دەبێت، بۆ ئەوەی لە چارەسەر کردندا پزیشك نەکەوێتە هەڵەوە، دەخوازێت پرسو ڕاوێژ بە پزیشکی پسپۆڕو شارەزای ئەو بوارە بکات، ماددەی (٥٥)ی یاسای مۆراڵی پیشە پزیشکیەکانی فەرەنسی ساڵی ١٩٧٩ دەبێژێ: ﴿ پزیشکی چارەسەرکار لەم بارانەدا لەسەریەتی ڕاوێژی پزیشکیی بکات:

أ - ئەگەر بۆ دەستنیشان کردنی نەخۆشیەکە ڕاوێژ کردن پێویست بوو، پزیشکەکە خۆی نەیتوانی لە دەستنیشان کردنی نەخۆشیەکەدا یەکلا ببێتەوە.

ب - ئەگەر ڕاوێژ کردنەکە لەسەر داوای نەخۆش، یان کەسوکاری نەخۆشەکە بوو﴾. [٩٦].

ئەگەر پزیشك ڕاوێژی بە پزیشکی پسپۆڕ نەکرد ئەوە هەڵەی کردووەو، لەسەر ئەوە سزا دەدرێت. لەو کاتانەدا نەبێت ڕێگریەك لە ڕاوێژکردن هەبێت، ئەگەر -پزیشکەکە-

ڕاوێژیکرد بەڵام بەبێ هۆیەکی پەسەند دەستنیشان کردنو چارەسەری پزیشکە پسپۆڕەکەی وەرنەگرتو، لەسەر غەڵەتەکەی خۆی بەردەوام بوو، ئەوە بە هەڵە دەژمێرێو، بەرپرسیارێتی دەکەوێتە ئەستۆ.

بڕیاری دادگای پێداچونەوەی عێراقی ژمارە ٣٣/ موسعة ثانية/ ٢٠٠١ لە ٣/ ١٢/ ٢٠٠١ ئاماژە بۆ ئەوە دەکات لەبەر ئەوەی پزیشك ڕاوێژی بە کەسی پسپۆڕ نەکردوە بەرپرسیارێتی درێغی کردنی دەکەوێتە ئەستۆ کە دەڵێ: ( داوالەسەرکراو (پزیشك) لەسەر ئەوەی مردووەکە نەخۆشیی شەکرەی هەبووەو، ڕاو بۆچونی پسپۆڕی هەناویی وەرنەگرتووە هەڵەی کردوە ... ئەمەش مانای وایە داوالەسەرکراو وەك پێویست خەمی چاودێری کردنی نەخۆشەکەی نەخواردوە ...). [٩٧].

ڕێنمایەکانی ڕەفتاری پیشەیی ژمارە (٦)ی ساڵی ١٩٨٥ی سەندیکای پزیشکانی عێراقی دەڵێ: ﴿ ئەو پزیشکەی لە دەستنیشان کردنی نەخۆشیدا هەڵە دەکات، بەرپرسیارێتی ناکەوێتە ئەستۆ ئەگەر سەلماندی پەنای بردوەتە بەر هەموو ئامڕازە زانستیو پزیشکیو کلینیکیەکانو، ئەو ئامڕازە یارمەتیدەرانەی دەستنیشان کردنی نەخۆشی کە لە دەڤەرەکەیدا بەردەست بوون، لە نێوانیشیاندا ڕاوێژی بە پسپۆڕان کردبێت﴾.

پوختەی قسان ئەوەیە پزیشك بەرپرسیارە ئەگەر هەڵەی کرد، بە مەرجێك هەڵەکردنەکەی بەڵگەبێت لەسەر ناشارەزاییەکی ئابڕوبەر لە هونەری پزیشکیدا، دەبێت دادوەر سنورێك دابنێ لە نێوان ڕاوبۆچونی زانستیو ناشارەزایی ئابڕوبەری هونەری پزیشکیدا، لە ڕاستیدا غەڵەتی زانستی لەو گومانەوە دروست دەبێت کە چواردەوری ڕوداوە پزیشکیەکانی داوە. [٩٨].

کاتێك پزیشك لە دەستنیشان کردنی نەخۆشیدا هەڵە بکات، هەڵەکە بەسەر چارەسەر کردنیشدا دەشکێتەوەو، هەڵە لە چارەسەر کردنەکەشدا دروست دەبێت، ئەوەش لەوانەیە ببێتە هۆی مردنی نەخۆشەکە، یان توشی کەمئەندامی گشتی یان لاوەکی هەمیشەیی یان کاتیی بکات، بۆیە لە دەستنیشان کردندا پشت بە ئامڕازە زانستیو هونەرییە تازەکان ببەسترێو، بەکارنەهێنانیان بە درێخی کردن دادەنرێتو، ئەگەر دەستنیشان کردنەکە دوربوو لە ڕاستی یەوە، یان پێچەوانەی ڕاستی بوو، بەرپرسیارێتی دەکەوێتە ئەستۆی پزیشك. [٩٩].

ئەگەر پزیشك ڕەچاوی بنەمای هونەریو زانستی كردو، لە دەستنیشان كردنی نەخۆشیەكەدا ئەركی خۆی بەجێ هێناو، هەموو توانای بە خەرجدا، بەرپرسیارێتی ناكەوێتە ئەستۆ، چونكە پابەند بوونەكەی لە چوارچێوەی توانا بەخەرجدانو درێخی نەكردنە (بذل العناية)، نەك بەئەنجام گەیاندن (تحقيق النتيجة)، پزیشك پابەندی بەخەرجدانی تەواوی توانایە، بە مەرجێك لەگەڵ بنەما زانستیو پزیشكیەكاندا ڕێك بێت. لە كاتی ئیشكردندا پزیشك دەكەوێتە دوو جۆر هەڵەوە، غەڵەتی زانستیو، كەمتەرخەمیی لە دەستنیشان كردنی نەخۆشیدا. [١٠٠].

٢ – غەڵەتی زانستی:

لەوانەیە پزیشك هەموو جۆرێكی وریاییو خۆپاراستن بگرێتەبەرو، هەموو ئەو ئامڕازە هونەریو زانستیانە بەكار بێنێ كە زانستی پزیشكیی پێی گەشتووە، كەچی لەگەڵ ئەوەشدا بەخت یاری نەبێتو، بكەوێتە غەڵەتەوە، دەبێت بپرسین ئایا لە هەموو بارێكدا پزیشك بەرپرسیارە؟ خۆ ئەگەر بەرپرسیار بوو، ئایا تا چەندە بەرپرسیارە؟ گەشتن بە هۆكاری ڕاستەقینەی نەخۆشیو زانینی سروشتو پلەكەیو فراوانبونو مەترسیەكانی كارێكی ئاسان نییە، بەڵكو ئاڵۆزو تێكەڵاوە، هەندێك جار نیشانە تایبەتەكانی نەخۆشیو ناڵاندنی نەخۆش پزیشك دەخەڵەتێنێو سەرگەردانی دەكاتو، بەرەو غەڵەتی دەبات، لەوانەیە غەڵەتی زانستی لە كەمیی زانستی پزیشكەوە، یان لە كەمیی ئامڕازە زانستیەكانەوە دروست ببێت. هۆكەشی ئەوەیە زانستی پزیشكیی نەگەشتووەتە لوتكەو، تیۆرە پزیشكیەكانیش تا ئێستاش جێی جیاوازی نێوان پزیشكەكانەو، نیشانەكانی نەخۆشیەكانیش ئەگەرچی جیاوازن، بەڵام هەندێك جار لە یەكتر دەچن، دەكرێت ئەمانە ڕێگری دەركەوتنی ڕاستیەكان بنو، پزیشك بكەوێتە غەڵەتەوە، لەم بارەدا ئەگەر پزیشك بنەچەی زانستی بەكارهێناو، ویژدانی خۆی كردە دادوەر ئەوا بەرپرسیارێتی ناكەوێتە ئەستۆ، چونكە بە هەڵە ناژمێرێ، بەڵكو بە غەڵەتی زانستی دادەنرێ. [١٠١].

غەڵەت كردن لە دەستنیشان كردندا سزای لەسەر نییە، تەنیا لەو بارەدا نەبێت كە لە كەمتەرخەمی یەوە دروست دەبێت. [١٠٢].

نموونەی ئەو غەڵەتانەی بەرپرسیارێتی پزیشکیی دروست دەکەن، وەك نەزانینی سەرەتاکانی پزیشکیی، یان کەمتەرخەمی کردن لە پشکنیندا،

**هەڵە کردن لە دەستنیشان کردنی نەخۆشیدا بەرپرسیارێتی بۆ پزیشك دروست ناکات ئەگەر سەلماندی هەموو ئامرازە پزیشکییە بنەڕەتییە بەردەستەکانی بەکار هێناوە، بەڵام بەرپرسیارە لە هەموو هەڵەیەك لە ئەنجامی کەمتەرخەمیەکانو پشکنینو تیشکیو تاقیکە دروست دەبێت.** [١٠٣].

**جیاوازیکردن لە نێوان هەڵەو غەڵەتدا:**

**أ – پێناسە:**

**﴿غەڵەت وەهمێکە لە زەینی کەسەکدا دروست دەبێت وایلێدەکات قەناعەتی پێچەوانەی واقیعو ئاراستەی گشتی بێت...﴾.** [١٠٤].

**﴿غەڵەت ساتێکی سەهوکردنو بێ ئاگایی یە، بەسەری مرۆڤدا تێدەپەڕێت﴾.** [١٠٥].

پێم باشە لە سەرەتادا ئەوە بڵێم: هەرچەند مانای (خطأ وغلط) لە زمانی عەرەبیدا ڕوونو دیارن، بەڵام لە زمانی کوردیدا هەردو وشەکە بە هەڵە بەرسڤە دەکرێن، ئەمەش وادەکات کاتێك دەڵێی: ئەمە غەڵەتێکی پزیشکییە، لێت تێناگەن، لە کاتێکدا هەڵە بەرپرسیارێتی دروست دەکات، بەڵام غەڵەت بەرپرسیارێتی دروست ناکات.

ئەگەر جیاکردنەوەی نێوان هەڵەو غەڵەت لە بواری بەرپرسیارێتی یاسایدا بە شێوەیەکی گشتی گرنگیەکی گەورەی هەبێت، تا بیرۆکەی هەڵە کە ڕەفتارێکی نادروستی کۆمەڵایەتیە، تێکەڵ بە بیرۆکەی غەڵەت نەبێت، کە بەستراوە بە چالاکی مرۆڤەوە، ئەوا گرنگی ئەم جیاکردنەوە لە کاری پزیشکیدا زۆر گەورەترە. کاتێك پزیشك کارەکەی ئەنجام دەدات چەندین گریمانە دادەنێت کە نەخۆش بیری لێ نەکردوەتەوە، هیچ یەکێکیش لەو گریمانانە ناگەنە پلەی متمانەی بەدەستهێنانی باشترین ئەنجام بۆ نەخۆش، سەرەڕای سوربوونی پزیشك لەسەر ڕونەدانی غەڵەت، کەچی ئەوەش پزیشك لە غەڵەت کردن ناپارێزێ، چونکە خەریکە بڵێین غەڵەت بەستراوە بە کاری پزیشکەوە، بە

تایبەت لە قۆناغی دەستنیشان کردنی نەخۆشیدا، چونکە نیشانەکانیان لە یەکترەوە نزیکن‌و شێوازەکانی دیاریکردنیشیان جیاوازن. (١٠٦).

جیاکردنەوەی نێوان هەڵەی پزیشکیی‌و غەڵەت، چەندە پێویستە ئەوەندەش وردەو، بۆ دادوەریش لەو پەڕی گرانیدایە، سەرەنجام کارەکە لە دەستی شارەزایانی پزیشکییدایەو، ئەوانیش دەتوانن یەکلای بکەنەوە. (١٠٧).

ب – جیاوازیی نێوان هەڵەو غەڵەت:

ـ هەڵە ڕەفتارێکە لە کەسێك ناوەشێتەوە لە ئەرکەکانیدا زیرەك‌و وریاو شارەزا بێت، بەڵام غەڵەت ساتێکی سەهوکردنەو بەسەر مرۆڤدا تێدەپەڕێ.

ـ لە دیدی ئەنجامە زانستیەکانەوە هەڵەکردن شتێکی چاوەڕوانکراوە، بۆیە دەبێت قەرزدار چاوەنواڕی بێت‌و وریا بێت، بەڵام غەڵەت کارێکە لە بێ ئاگایی دروست دەبێت‌و، ناکرێت خۆتی لێ لابدەیت.

ج ـ هەڵەکردن لە پیشەی پزیشکیدا دەرچونە لە ڕەفتاری باو، بەڵام غەڵەت کردن بەستراوە بە لاوازیی مرۆڤەوە.

د ـ (J. Penneau) دەڵێ: گومانی تێدا نییە هەموو هەڵەیەك بەغەڵەت دادەنرێت، غەڵەت وەك پۆل (صنف) دەردەکەوێت‌و، هەڵەش وەك جۆر (نوع)، بە چەند مەرجێك نەبێت لێی جیانابێتەوە. (١٠٨).

پێوەری جیاکردنەوەی هەڵەی پزیشکیی‌و غەڵەتی زانستی:

پێوەری جیاکردنەوەی هەڵەو غەڵەت بۆ پێوانەکردنی هەڵەی پزیشك پێوەرێکی گشتی یە، ئەگەر پزیشکەکە کارێکی لە دەست دەربچێ، بەڵام هەمان کار لە پزیشکێکی ئاسایی هەمان پسپۆڕیەوە نەوەشێتەوە، ئەو کارە بە هەڵە دادەنرێت. بەڵام ئەگەر پزیشکەکە وەك پزیشکێکی ئاسایی لە هەمان ڕەوشدا توانای خۆی بەکار هێناو، ڕێگای زانستی گرتەبەرو، هەموو ئامرازە بەردەستەکانی بەکارهێناو، لەتەك ئەوەشدا خەمڵاندنەکەی پێچەوانەی واقیع بوو. ئەوە –ئەوکردارە– غەڵەتێکی ڕوتەو، هیچی تر.

دانانی پێوەری گشتی بۆ جیاکردنەوەی هەڵەو غەڵەت ئەنجامێکی گرنگی دەبێت، ئەویش ئەوەیە گرتنەبەری ڕێڕەوێك لە لایەن پزیشکێکی گشتی یەوە لە بابەتێکی تایبەتدا لەوانەیە بە غەڵەت دابنرێت، بەڵام گرتنەبەری هەمان ڕێڕەو بۆ پزیشکێکی پسپۆڕ بە هەڵە دابنرێت، بە مانایەکی ئاسایی ئەوەی لە پزیشکە گشتیەکەوە ڕویداوە ناکرێت لە پزیشکە پسپۆڕەکە ڕوبدات.جیاوازی دوو حاڵەتەکە ڕەچاوکردنی لە بەرچاو گرتنی ئەو بوارە زانستیەیە کە دەبێت هەر یەکێکیان بایەخی پێ بدات.

دادوەریی لە سەر ئەوە جێگیر بووە غەڵەتکردن لە دەستنیشان کردنی نەخۆشیدا بە هەڵە دانەنرێت‌و، بەرپرسیارێتیش نەخرێتە ئەستۆی پزیشك... دادگای پێداچوونەوەی فەرەنسی بڕیاریدا غەڵەتکردن لە دەستنیشان کردنی نەخۆشییدا لە خودی خۆیدا بە هەڵە دانانرێت‌و بەرپرسیارێتی ناخاتە ئەستۆی پزیشك. دادگای پێداچوونەوەی کوەیت‌و یەمەنیش هەمان بۆچونیان هەیە. زۆرینەی فەقیهەکانیش دەڵێن: غەڵەتکردن بەرپرسیارێتی ناخاتە ئەستۆی پزیشك.[١٠٩]

بڕیاری ١٩٨٧/١١/٢٤ی دادگای پێداچوونەوەی فەرەنسی دووپاتی ئەوەی کردەوە: (غەڵەتکردن لە دەستنیشان کردنی – نەخۆشیدا– لەبەر ئەوەی لە کەمتەرخەمی‌و هەڵەشەیی یەوە نەبووە، بە هەڵە دانانرێت تا بەرپرسیارێتی لێ بکەوێتەوە).[١١٠]

د. عبدالرشید مأمون دەڵێ: « دادپەروەیی تێدا نییە هەموو غەڵەتێك بە هەڵە دابنرێت‌و، بەرپرسیارێتی پزیشکیی لێ بکەوێتەوە، چونکە ئەم تێڕوانینە ڕەوشێکی بێزارکەر بۆ پزیشك دروست دەکات‌و، لە کاتی کارکردنیاندا کاریگەریی لەسەر چالاکیەکانیان دەبێت.[١١١]

دادگای تێهەڵچونەوەی میسری ئەهلی لەم بارەوە دەڵێت: « زانایانی یاسا لەسەر ئەوە کۆکن پزیشك بەرپرس نییە لە هەڵەکردن لە دەستنیشان کردنی نەخۆشیدا، بە تایبەت ئەگەر نیشانەکان لە یەکتر بچن ».[١١٢]

لە عێراقیشدا بەم شێوە هاتووە: لە ڕێنمایەکانی ڕەفتاری پیشەیی ژمارە (٦٠) سەندیکای پزیشکان لە عێراق سالی ١٩٨٥ دەڵێ: « هەڵەکردن لە دەستنیشان کردنی نەخۆشیدا بەرپرسیارێتی ناخاتە ئەستۆی پزیشك، ئەگەر سەلماندی هەموو ئامرازە زانستی‌و پزیشکی‌و کلینیکیەکانی بەکارهێناوە‌و، ڕاوێژی لەگەڵ پسپۆڕاندا کردوە –

ئەگەر هەبن– بە هەمان شێوە ئامرازە یارمەتیدەرەکانی دەستنیشان کردنی بەدەستهاتوی بەکار هێناوە).

بە پێچەوانەی ئەوانەی پێشتر باسکران، ئەگەر ڕەوشی نەخۆش لەو ڕەوشانە بوو دەکرا بە ڕێگەی زانستی باو دیاری بکرێت، بەڵام پزیشکەکە ئەو ڕێگانەی نەدەزانیو، ڕێگایەکی گرتە بەر لەگەڵ بنەچە زانستییەکاندا نەدەگونجاو، یەکیان نەدەگرتەوە، بێگومان ئەمە لە پزیشکێکی ئاسایی ناوەشێتەوە، بۆیە ئەم ڕێڕەوە بە هەڵە دادەنرێتو، بەرپرسیارێتی لیَ دەکەوێتەوە. [113].

**٣ – کەمتەرخەمی کردن لە دەستنیشان کردندا:**

ئەو ڕێسایەی کە دەڵێت غەڵەتکردن لە دەستنیشان کردنی نەخۆشیدا بەرپرسیایێتی ناخاتە ئەستۆی پزیشك، ئەوە ڕێسایەکی ڕەها نییە، چونکە ئەگەر هەڵەکردن بە هۆی سەرپێچی کردنی بنەما زانستیە جێگیرەکانەوە بێت کە هەموان دانیان پێدا ناوە، یان غەڵەتەکەی لە نەزانینێکی ئاشکراوە بێت، یان لە کەمتەرخەمیەوە بێت، ئەوە بەرپرسیارێتی تاوانکاریو شارستانی دەخاتە ئەستۆی پزیشك. یاسا ناڵێت پزیشك هەرگیز غەڵەت ناکات، بەڵام ڕێگاش نادات بە هەڵەشەییو، بەبێ زانیاریی پێویستو، بەبێ بەکارهێنانی ئەو ئامێرانەی زانست داوادەکات لە توێژینەوەو لێکۆڵینەوەدا بەکاربهێنرێن بۆ دەستنیشان کردن. [114].

دەبێت پزیشك بایەخی تەواو بدات بە نەخۆشو، هەوڵی وریایانەو ڕاستگۆیانەی لەگەڵدا بدات، ئەگەر هەڵەکردن لە دەستنیشان کردندا بگەڕێتەوە بۆ کەمتەرخەمیو گوێپێنەدانو، لەو هەڵەیشەوە نەخۆش توشی ناتەواویەك، یان پەککەوتنێکی کاتی، یان هەمیشەیی بوو، یان مرد، ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕەفتارە خراپە کە پزیشك بەرامبەر نەخۆش دەیکات، ئەگەر پزیشك ئەو ئامرازە پزیشکیانەی بەکار نەهێنا کە بنەمای زانستی پزیشکیی دەیخوازێتو، زانیاری تەواوی لە نەخۆشەکە وەرنەگرت کە یارمەتی بدەن نەخۆشیەکە بدۆزێتەوە، ئەوە پزیشك بە هەڵە دادەنرێتو، بەرپرسیارێتی یاسایی دەکەوێتە ئەستۆ.

له ڕێنمایەکانی ڕەفتاری پیشەیی پزیشکانی عێراقدا دەڵێت: ﴿ ئەگەر سەلمێنرا بەبێ بوونی هۆیەکی زانستی پزیشك بە ئەنقەست کەمتەرخەمی کرد لە ڕاوێژکردن‌و ئەنجامەکانی پشکنینە یارمەتیدەرەکان، ئەوە بەرپرسیار دەبێت﴾.

له بڕیارێکی لیژنەی فەرمانبەرانی وەزارەتی تەندروستیدا هاتووە: ﴿ لە کەیسێکدا ڕوداوەکانی بەم شێوەیە، کیژێك بە ناوی (ل) لە بنکەی پۆلیسی (...) نێردرا بۆ نەخۆشخانەی (...) بۆ پشکنین، تا بزانرێت، ئایا پەردەی کچێتی لابراوە؟ ئایا پاشبازی لە تەکدا کراوە؟ ئایا سکی پڕە یان نە؟ لەگەڵ دیاریکردنی تەمەنی.

له لایەن دکتۆرە (ع) پشکنین بۆ کیژۆڵەکە کراو، لە لایەن دکتۆرە (ع)و دکتۆر (س)ەوە ڕاپۆرتێك نوسرا، بەم شێوە: کیژۆڵەکە پەردەی کچێتی لابراوەو، پاشبازی لە تەکدا کراوەو، نیشانەی سکپڕی پێوە دیار نییەو، تەمەنیشی بە شانزە ساڵ دەخەمڵێنرێ! ڕاپۆرتەکە ڕەوانەی بنکەی پۆلیس کرایەوەو، لە هەمان کاتدا بە مەبەستی گەڕان بۆ سپێرم سڕینەیەك لە لاشەی کچەکە وەرگیراو، نێردرا بۆ پەیمانگای پزیشکیی دادیی بەغدا، بەڵام کەسوکاری کیژەکە بە پەلە بە فیشەك کچەکەیان کوشت، بە مەبەستی توێکاری کردن‌و، ڕوونکردنەوەی هۆی مردنەکەی تەرمەکەیان ڕەوانەی نەخۆشخانە کرد، تەرمەکە خرایە بەردەست کۆمەڵێك پزیشکی پسپۆڕ، بێجگە لەوانەی لە ڕاپۆرتەکەدا ناویان هاتوە، ئەنجامی توێکاریەکە ئاشکرای کرد پەردەی کچێتی ساغەو، سکی پڕنییەو، پاشبازی لەگەڵدا نەکراوە! لەبەر جیاوازیی نێوان دوو ڕاپۆرتەکە، بڕیاردرا گۆڕەکەی هەڵبدرێتەوەو تەرمەکەی دەربهێنرێتەوەو، ڕەوانەی پەیمانگای پزیشکیی دادیی بەغدا بکرێت، ئەنجامەکەی ئەوە بوو پزیشکە دادیەکان پشتگیری ڕاپۆرتی لیژنەی دووەمیان کرد، لە ئەنجامی هەڵەکردنی دکتۆرە (ع)و دکتۆر (س) لە دەستنیشان کردنەکەدا ڕەوانەی لیژنەی بەرزەفتکاری کران، لیژەنەکە بڕیاری ئەوەیدا کارەکەیان هەڵەیەو، پێچەوانەی ئەو بناغەیە کە ئەم پیشە دەیخوازێت، لە هەمان کاتدا بڕیاریدا نەخۆشخانەکەش لە لایەنی کارگێری یەوە بەرپرسیارە، چونکە درێخی کردوە لە چاودێری‌و سەرپەرشتی پزیشکەکانی، کە بوو بەهۆی مردنی گەنجێکی بێتاوانی سەرەتای تەمەنی، لەبەر ئەوە کەیسەکە ڕەوانەی دادگای تاوانەکان کرا بە مەبەستی ڕێکاری دادگایی کردنیان. [١١٥]

**سێیەم: هەڵەکردن لە چارەسەرکردندا:**

دوای دەستنیشان کردنی نەخۆشیەکەو، زانینی سروشتو شێوازی بڵاوبوونەوەی، نۆرەی چارەسەرکردن دێت، ئەگەرچی پزیشك سەرپشکە لە دیاریکردنی شێوازی چارەسەرکردندا، بەڵام دەبێت شێوازەکە لەسەر بناغە زانستیە جێگیرەکان بێتو، لەتەك باری نەخۆشەکەدا گونجاو بێت، بە جۆرێك زۆرترین کاریگەریو، کەمترین مەترسی هەبێت، بە مانایەکی تر سودەکەی لە مەترسیەکەی زیاتر بێت.(١١٦)

هەڵبژاردنی ڕێگایەکی چارەسەر کردنو هەڵنەبژاردنی ڕێگایەکی دیکە، نابێتە هۆی بەرپرسیارێتی، ئەگەر ڕێگایەکی دروستو زانستیو باوی گرتبێتەبەر، بەرپرسیارێتی پزیشك بە شێوەیەکی ڕەها لەسەر جۆری ئەو چارەسەرە دروست نابێت کە هەڵیدەبژێرێ، مەگەر بسەلمێنرێ ئەو هەڵبژاردنە لە نەزانینی بنەما زانستیو هونەریەکانی پزیشکیەوە بووە ... ئەگەر پزیشك لە هونەری پزیشکیدا نەگەشتبوویە پلەیەکی دیاریکراوی شارەزاییو لێزانینو، پێویستی بە یارمەتی کەسێکی پسپۆڕ بوو، قورسو گران بوو بەبێ پەنابردن بۆ پزیشکێکی ڕاوێژکار چارەسەرەکە بکات، ئەگەر لە چارەسەر کردندا بەگوێرەی ئەو ڕێنمایانە چارەسەری نەکرد کە پزیشکە ڕاوێژکارەکە پێشنیاری کردوە، ئەوە هەڵەیەکی گەورەی کردوەو، بەرپرسیارێتی دەکەوێتە ئەستۆ.(١١٧)

پزیشك بە هەڵە دادەنرێتو، لەسەر هەڵەکەیشی لێپرسینەوەی لێ دەکرێت ئەگەر بەبێ کردنی پشکنینی پێویست چارەسەری نەخۆشەکەی بکات، یان لە چارەسەر کردنی پێویستدا کەمتەرخەمی بکات، وەك ئەوەی نەخۆشەکە برینێکی قوڵی هەبوو بەڵام پزیشکەکە کەمتەرخەمی بکاتو، دژە گزازی لێ نەدات، یان لەسەر بینینە سەرەتاییەکان بڕیاری چارەسەر کردن بدات، یان پزیشك لە چارەسەر کردندا وریاو خەمخۆر نەبێت، یان بەراوردی نێوان مەترسی چارەسەر کردنەکەو نەخۆشیەکەی نەکات.(١١٨)

**چوارەم: هەڵەکردن لە نەشتەرگەریدا:**

گومانی تێدا نییە بڵندترین پیشەی پزیشکیی خزمەتی بە مرۆڤایەتی کردبێت نەشتەرگەریە، دەشزانین کاری نەشتەرگەری سودێکی زۆری هەیە، بە تایبەت بۆ ئەوانەی بە دەست ئەو نەخۆشیانەوە دەناڵێنن بە نەشتەرگەری بۆکردن نەبێت چارەسەریان نییە،

کاری نەشتەرگەریش لە خۆیدا مەترسیدارە، ئەوەش دەخوازێت پزیشك وردەکاری تەواو بکاتو، بگاتە ئەو ئەنجامەی چارەسەری ئەو نەخۆشیە تەنیا نەشتەرگەری بۆکردنە.[119].

نەشتەرگەری وەك یەکێك لە لقە پزیشکییەکان بە بوارێکی فراوان دادەنرێت بۆ دیراسە کردنی بەرپرسیارێتی هەموو جۆر و شێوەکانی پزیشکی، چونکە هەڵەی نەشتەرگەری لە بواری بەرپرسیاریەتی شارستانی پزیشکیدا هەڵەی نموونەییە. گرنگی بەرپرسیارێتی پزیشکی نەشتەرگەر لە میانەی گرنگی خودی نەشتەرگەرییەکەوە دەردەکەوێت، چونکە زۆر ورد و زۆریش مەترسیدارە، بۆیە دەخوازێت نەشتەرگەر زۆر بە بایەخ و وریایی و ئاگادارییەوە ئەنجامی بدات، نەشتەرگەریش ڕێسای گشتی بەرپرسیارێتی پزیشکی دەیگرێتەوە کە پابەند بوونە بە درێخی نەکردن و توانا بە خەرجدان، نەك بەدیهێنانی ئەنجام ئەوەی پزیشکان لەسەری ڕێکن کاری نەشتەرگەری بە سێ قۆناغدا تێدەپەرێت:

قۆناغی پشکنین و ئامادەکاری بۆ پرۆسەی نەشتەرگەری .

قۆناغی جێبەجێکردنو، ئەنجامدانی نەشتەرگەری .

قۆناغی سەرپەرشتی و بەدواداچونی نەخۆش تا چاکدەبێتەوە.

بەرپرسیارێتی پزیشکی نەشتەرگەر لە هەر سێ قۆناغەکەدا بەردەوامە.[120].

لەبەر ئەوەی کاری نەشتەرگەری پەیوەندی بە لاشەی مرۆڤەوە هەیە، بۆیە دەخوازێت زۆر گرنگی پێبدرێتو، خەمی بخورێت، چونکە ئاستێك مەترسیو سەرەرۆیی تێدایە، بۆیە ئەگەر پزیشك لە پێشو لە کاتو لە دوای نەشتەرگەریەکە وریا نەبێتو خەم نەخوات بەرپرسیاێتی دەکەوێتە ئەستۆ، بۆیە دەبێت بە وردی پشکنینی سەرەتاییو تەواوکاری ئەنجام بدرێت، نەك تەنیا بۆ ئەو شوێنەی نەشتەرگەری بۆ دەکرێت، بەڵکو پشکنینی گشتی بۆ بکرێت تا بزانرێت ئایا نەخۆشەکە بەرگەی نەشتەرگەری دەگرێت؟[121]. دەبێت هەموو مەترسیەکانی نەشتەرگەری ڕابگەیەنرێت بە نەخۆشو، ڕەزامەندی وەربگیرێتو، هەموو پێویستیەکانی نەشتەرگەری ئامادە کرابێت، وەك ئامێرو ستافی نەشتەرگەری هەر لە پزیشکی بەنجەوە تا یاریدەدەرو پەرستار، لەگەڵ پشکنینی تەواو، دەبێت پزیشکی نەشتەرکار تەواوی توانای خۆی بخاتە گەڕ.

**لەم حاڵەتانەدا پزیشکی نەشتەرکار بەرپرسیارێتی دەکەوێتە ئەستۆ:**

- ڕەزامەندی وەرنەگرتنی نەخۆش، مەگەر لە بارێکدا نەخۆش نەتوانێت ڕەزامەندی خۆی دەرببڕێت و، نوێنەریشی ئامادە نەبێت.
- پیسبونی برین، بە تایبەت ئەگەر قوڵ بێت و، دژە تیتانۆسی بەکار نەهێنابێت.
- ئەنجام نەدانی پشکنینی ورد بۆ نەخۆشەکە پێش نەشتەرگەریەکە.
- کەمتەرخەمی و هەڵەشەکردن لە بەکارهێنانی ئامێرەکاندا.
- ئامادەنەکردنی پزیشکی بەنج و، پێدانی بەنج لە لایەن پزیشکی نەشتەرکارەوە.
- پزیشك بەرپرسیارە لە هەر هەڵەیەکی ستافەکەی. سەرەڕای ئەوەی خۆیشیان بەرپرسیارن.
- لەبیرچونی هەر شتێك لەناو جەستەی نەخۆشدا.
- سەرپەرشتی و چاودێری نەکردنی نەخۆشەکە دوای نەشتەرگەری.[١٢٢]

**بڕیاری دادگای پێداچوونەوە لەبارەی هەڵەی نەشتەرگەریەوە:**

لەبیرچوونی شتێك لە لاشەی مرۆڤدا بەرپرسیارێتی بۆ پزیشکی نەشتەرگەر دروست دەکات، دادگای پێداچوونەی عێراقی لە بڕیاری ژمارە (١٥٥٤) لە ١٢/٤/ ١٩٩٠بەم شێوە بڕیاری دەرکرد، لە کەیسێکدا ڕوداوەکەی بەم شێوەیە: لە نەخۆشخانەی یەرموك پزیشکێك نەشتەرگەری کرد بۆ نەخۆشێك، پاش ماوەیەك دوای نەشتەرگەریەکە ئازارێکی زۆر دروست بوو بۆ نەخۆشەکە، ماوەیەکی زۆر لە جێگادا کەوت، پاش پشکنینی تیشکی دەرکەوت (مقص)ێك لە لاشەیدایە، لە کاتی نەشتەرگەیەکە لەبیرچووە، نەخۆشەکە ناچار بوو نەشتەرگەریەکی تر بکاتەوە بۆ دەرهێنانی مەقەستەکە، بە هۆی بوونی مەقەستەکە بەشێك لە گەدەی خراپ بوبوو، ناچار ئەو بەشە لابرا، ئەمەش زیانی پێ گەیاندو، ناتەواوی هەمیشەیی بۆ دروست کرد، کە نەتوانێت بە شێوەیەکی سروشتی ژیان بەسەربەرێت، بۆیە دادگا بڕیاری دەرکرد –پزیشکی نەشتەگەر– هەڵەی کردوە بۆیە بەرپرسیارە، بەوپێیە پابەندی کرد بە قەرەبوو کردنەوەی نەخۆشەکە. دادگای پێداچوونەوەش ئەو بڕیارەی پەسەند کرد.[١٢٣]

**پێنجەم: هەڵەکردن لە سڕکردنی نەخۆشدا:**

بەنج یەکێکە لە بەخششەکانی خوا بۆ مرۆڤەکان، چونکە لە کاتی چارەسەر کردندا ڕێ لە هەست بە ئازارکردن دەگرێت، بە تایبەت لە کاری نەشتەرگەریدا کە پێویستە نەخۆش هێورو ئۆقرە گرتوو بێت، لە هەمان کاتدا ڕۆڵی سەرەکی هەبوو لە پێشکەوتنی نەشتەرگەریو، چارەسەردا، چونکە هەندێك نەخۆشی بە نەشتەرگەری نەبێت چارەسەر ناکرێتو، نەشتەرگەریش بەبێ بەنجکردن ئەنجام نادرێت، بە تایبەت نەشتەرگەریی گەورە. لە مێژەوەیە بەنج بەکاردێت ئەگەرچی بە شێوەیەکی سەرەتاییش بوبێت، بەڵام بەم شێوە بەکارهێنانە زانستێکی نوێ یەو، لە ساڵی (١٨٤٦)ەوە لە ئەورووپا بەکاردێتو، بەردەوام بەرەو پێشکەوتن دەچێتو، چەندین ئامێری پێشکەوتوو دروست کراون یارمەتیدەری پزیشکن لە کارەکەیدا، ڕۆڵی پزیشکی بەنج لە سڕکردنو بەئاگاهێنانەوەدا قەتیس نییە، بەڵکو پشکنین بۆ نەخۆش دەکاتو، ئامادەی دەکات بۆ نەشتەرگەریو، بەدواداچوونو چاودێری نەخۆش دەکاتو، ئازاری دوای نەشتەرگەری دەشکێنێ.

**بەنج چی یە؟**

- بەنج واتە: نەمانو لەدەستدانی هەستەکان.
- بەنج ئەو هونەرو زانستەیە لە میانەی سڕکردنەوە هەستو پەرچەکرداری ئەو بەشە لەناو دەبات کە نەشتەرگەری بۆ دەکرێت.[١٢٤]

هەرچەند بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان لە بنەڕەتدا بەپێی یاسای مادده هۆشبەرەکانی ژمارە (٦٨)ی ساڵی ١٩٦٥ کە لە ژمارە ( ١١١٧)ی وەقایعی عێراقیدا بڵاو کراوەتە. -کڕینو فرۆشتنی، بازرگانی پێوەکردنی، بەکارهێنانی، هێنانو بردنی_ قەدەغەکردوە، بەڵام بەپێی ماددەی (٨)ی ئەم یاسایە ڕێگای داوە بۆ مەبەستی پزیشکیی بەکاربهێنرێ.[١٢٥]

دەبێت پزیشکی سڕکەر ئەم کارانە ئەنجام بدات، ئەگینا بەرپرسیارێتی دەکەوێتە ئەستۆ:[١٢٦].

١ – پێش نەشتەرگەری:

- ڕۆژێ پێش نەشتەرگەری نەخۆشەکە ئامادە بکاتو، ڕێنمایی پێویستی لە بارەی خواردنو خواردنەوە پێ بدات.
- پشکنین بۆ نەخۆشەکە بکات، ئەگەر ئەو کارەی بە کەسێکی دیکەی وەك پەرستارێك سپاردو، خۆی پێی هەڵنەسا، ئەوە هەڵەی کردوەو، بەرپرسیارێتی دەکەوێتە ئەستۆ.
- دەبێت دڵنیا بێت گەدەی نەخۆش چۆڵەو، خواردنی نەخواردوە.
- دەبێت دڵنیا بێت هەموو ئامێرەکان دروستو پاکژبن.
- بڕی دۆزی ئەو بەنجە دیاری بکات کە دەیدات بە نەخۆش.

٢ – لە کاتی نەشتەرگەریدا:

- بەردەوام چاودێری باری نەخۆشەکە بکات، وەك: هێڵکاریو لێدانی دڵو، فشاری خوێنو، پلەی گەرمی ..

٣ – دوای نەشتەرگەری:

- وەستاندنی گازی بێهۆشکەر.
- بەئاگاهێنانەوەی نەخۆش.
- سەردانی نەخۆش لە ژورەکەیدا، بۆ دڵنیابوون لە تەندروستیو، دەبێت بەردەوام سەرپەرشتیو چاودێریی بکات تا بە تەواوەتی بە ئاگادێتەوەو، ئەندامەکانی لەشی دەکەونەوە کار، هەموو کەمتەرخەمییەك هەڵە پێکدێنێتو بەرپرسیارێتی دروست دەکات.
- پاراستنی نهێنی نەخۆش، چونکە لەوانەیە لەکاتی بەئاگاهاتنەوەیدا نەخۆش هەندێك قسە بکات، نابێت ستافی پزیشکیی هیچ قسەیەك لەو وتانە بدرکێنن.

دادوەریی عێراقی لەسەر ئەو ڕێچکەیە ئەگەر پزیشکی سڕکەر زیانی بە نەخۆش گەیاند ئەوە بەرپرسیارێتی دەکەوێتە ئەستۆ.

بڕیاری دادگای پێداچونەوەی عێراقی ژمارە ( ٤٨٥ –م٣– ١٩٩٨ کە لە ١٩٩٨/٤/٧ دەرچووە دەڵێ: پزیشکێکی بەنج لە نەخۆشخانەیەکی میریدا کاردەکات، لە ئەنجامی

هەڵەکردن و کەمتەرخەمی لە کاتی بەنجکردنی نەخۆشەکەیدا بۆ نەشتەرگەری، بوو بە هۆی مردنی نەخۆشەکە، دادگا بڕیاریدا بڕی (٨٠٠٠٠٠) دینار بدرێت بە سکاڵاکار وەك قەرەبووی ئەو زیانە ماددی و ئەدەبیەی بەهۆی مردنی باوکیەوە لێی کەوتووە.[١٢٧]

## شەشەم: هەڵەکردن لە چاودێریکردن و بەدواداچووندا:

گرنگترین قۆناغی کاری پزیشکیی چاودێری کردنە، بە تایبەت دوای نەشتەرگەریی، چونکە کاری پزیشکیی لە نوسینی ڕەچەتەی دەرمان و، چارەسەرکردنی نەخۆشدا ناوەستێت، بەڵکو کاری پزیشکی دەخوازێت چاودێری نەخۆش بکات تا بزانێت ئەنجامی دەرمانەکە بە کوێ گەشتووەو، چەندە سەرکەوتوو بووە، بە تایبەت ئەگەر دەرمانەکە دەرمانێکی مەترسیدار بێت و، لە دەرمانە باوەکان نەبێت، لەم کاتەدا دەبێت پزیشکی چارەسەرکار خۆی چاودێریەکی وردو هۆشیارانەی نەخۆش بکات.[١٢٨]

بە دواداچونی نەخۆش ئەوە ناگەیەنێ پزیشك لەگەڵ نەخۆشەکەدا بمێنێتەوە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە نابێت چاودێری تەندروستی نەخۆش نەکات و، نابێت مۆڵەتی نەخۆش بدات لە نەخۆشخانە دەربچێت ئەگەر باری تەندروستی پێویستی بە مانەوە کرد، لە هەمان کاتدا ئەگەر پێویست بوو دەبێت پزیشك ئامادەی لای نەخۆش ببێت لە نەخۆشخانە، یان لە کلینیکی خۆی. ئەگەر نەخۆشیەکەش سادەو ئاسایی بوو، ئەوەندە بەسە پزیشك دەرمانی بۆ بنوسێت و، نەخۆشەکە ئاراستە بکات و، نەخۆشەکە خۆی بەدواداچوونی بۆ بکات، بەڵام ئەگەر بارودۆخی نەخۆشەکە مەترسیدار بوو، یان ئەو دەرمانەی بەکار هاتبوو مەترسیدار بوو، لێرەدا دەبێت پزیشك خۆی چاودێری نەخۆشەکە بکات و، بزانێت بارودۆخی بەرەو کوێ دەچێت.

لە کاتی گواستنەوەی خوێنیش بۆ نەخۆشێك بە مەبەستی پاراستنی نەخۆشەکە لە هەر کاردانەوەیەکی نەخوازراو دەبێت پزیشك ڕێگا نەدات دوای گواستنەوەی خوێنەکە ڕاستەوخۆ نەخۆش لە کلینك، یان نەخۆشخانە دەربچێت.

لە نەخۆشیە دەماری و ژێریەکاندا پابەندبوونی پزیشك بە چاودێری کردنی نەخۆشەوە زیاتر دەبێت، نەك تەنیا بۆ لایەنی پزیشکیی، بەڵکو سەرپەرشتی و چاودێری هەڵسوکەوت و پاراستنی لە زیان گەیاندن بە خۆی و بە خەڵکانی تریش.[١٢٩]

لێرەدا پرسیارێك دێتە گۆڕێ، ئایا لە کاتی چاودێری نەکردنی نەخۆش، بەرپرسیارێتی دەکەوێتە ئەستۆی پزیشکی سرکەر یان پزیشکی نەشتەرگەر، یان ئەستۆی هەردووکیان؟

بۆ وەڵامەکەی دوو گریمانە هەیە:

**گریمانەی یەکەم:** پرسی بە ئاگاهێنانەوەی نەخۆش ئەرکی پزیشکی بێهۆشکارە، بەڵام ئەگەر پزیشکی نەشتەرگەر خۆی بەنجی نەخۆشەکەی کرد، یان یاریدەدەرێکی پسپۆر بەنجەکەی کرد، ئەوە ئەرکی پزیشکی نەشتەرگەرە نەخۆشەکە بە ئاگا بهێنێتەوە.

**گریمانەی دووەم:** ئەوەی پەیوەندی بە نەشتەرگەریەکەوە هەیە، چاودێری ئەوە بەرپرسیارێتی پزیشکی نەشتەرگەرو پزیشکی چاودێری وردە، بەڵام چاودێری کردنی دوای ئەوە ئەرکی پەرستارە.

**حەوتەم: هەڵەکردن لە پێشکەشکردنی شارەزایدا:**

**شارەزا کێیە؟**

شارەزا ئەو کەسەیە لە کارێکدا پسپۆڕەو، بە بەردەوام جێبەجێ کردنی کارەکە تێیدا قوڵ دەبێتەوەو، شارزاییەکی پراکتیکی گەورە بەدەست دێنێ.[١٣٠]

**پزیشکی دادیو شارەزایی:**

پزیشکی دادی ئەو پزیشکەیە سەرەڕای خوێندنی زانستە پزیشکیەکان خوێندنێکی پسپۆڕی دەخوێنێ لە بارەی بەرکەوتنە تاوانکاریە جۆراوجۆرەکانی وەك: چۆنیەتی ڕودانی ڕوداوەکەو، ئامرازی پێکانەکەو، هۆی مردنەکەو. تاوانەکانی دەستدرێژی کردن ...[١٣١]

**دادگاو ڕاسپاردنی شارەزا:**

جێی گومان نیە یەکلاکردنەوەی ناکۆکیەکان دەبێت بە پێی یاسا بێتو، شوێنی جێبەجێ کردنی یاساش دادگاکانن، دادوەریش ئەوکەسەیە کۆتا بڕیار دەدات، بۆ ئەو بڕیاردانەش بەڵگەی یەکلاکەرەوە هەبێت، هەندێك جار سەلماندنی بەڵگەکان شارەزاییەکی پێویستە لە هونەرێکی تایبەتدا، لە کەیسە تاوانکاریەکاندا پزیشکی دادی

ئەو لایەنەیە دادگاو لێکۆڵەر پەنای بۆ دەبەن، هەر کاتیش داوای لێکرا نابێت نکولی بکات. بڕگەی (أ)ی ماددەی (٦٩)ی یاسای اصول المحاکمات الجزائیە ژمارە (٢٣)ی ساڵی ١٩٧١ دەڵێ: ﴿ دادوەرو لێکۆڵەر دەتوانن لە خۆیانەوە، یان لەسەر داوای نەیارەکان شارەزایەك یان زیاتر ڕاسپێرن بۆ ڕادەربڕین لەسەر ئەو تاوانەی لێکۆڵینەوەی لە بارەوە دەکرێ﴾. ماددەی (١٣٣)ی یاسای سەلماندنی ژمارە (١٠٧)ی ساڵی ١٩٧٩، هەمان شت دەڵێت.

یاسای پزیشکی دادی ژمارە (٣٧)ی ساڵی ٢٠١٣ لە خاڵی پێنجەمدا ئەرکەکانی پزیشکی دادی دیاری دەکات، لە بڕگەی (د) دەڵێ: دەربڕینی ڕای هونەری لەو ڕوداوە پزیشکیانەی دەخرێنە بەردەم دادوەری.

لە بڕگەی (ز) دەڵێ: پشکنینی ئەو ڕوداوانەی لە تاوانی دژ بە ڕەوشتو ڕەویەی گشتی دەکەونەوە.

لە بڕگەی دووەمی ماددەی (١٠١)ی یاسای تەندروستی گشتی ژمارە (٨٩)ی ساڵی ١٩٨١ دەڵێ: ﴿ ئەگەر نەخۆشێکی پێکراو برایە لای پزیشکێکو پزیشکەکەش گومانی ئەوەی بۆ دروست بوو ئەو پێکرانە بە هۆی کردارێکی تاوانکاریەوە ڕویداوە، کەسەکە مردبێت یان نەمردبێت، – ئەگەر نەمردبوو– پاش چارەسەر کردن هەواڵ دەگەیەنێت بە نزیکترین بنکەی پۆلیس، ئەگەر مردیش تەرمەکەی ڕەوانەی پزیشکی دادی دەکات بۆ دیاریکرنی هۆی مردنەکەی﴾. بەپێی ئەو دەقە یاسایانەی سەرەوە ئەو کەیسە تاوانکاریانە پێویستیان بە یەکلاکردنەوە هەیە، دەسەڵاتی پەیوەندار داوا لە پزیشکی دادی دەکات وەك شارەزا ڕای خۆی دەربڕێ. ئەگەر نەخۆشو پێکراوێکیش سەردانی پزیشکێکیان کردو ڕوداوەکە جێی گومان بوو، دەبێت دەستبەجێ هەواڵ بگەیەنێت بە نزیکترین بنکەی پۆلیس، تا لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت ئایا ڕوداوەکە تاوانکاریە یان ڕوداوێکی ئاساییە؟

**هەڵەی پزیشکی دادی لە کوێدا ڕودەدات؟**

خاڵی یەکەم: پابەندبوونی پزیشکی دادی پابەندبوونە بە ئەنجام گەیاندن، واتە لە توێکاریو پشکنینو ڕاپۆرت نوسیندا دەبێت هەڵەی تێدا نەبێت، چونکە کاری پزیشکی دادی گریمانە هەڵناگرێت.[١٣٢]

خاڵی دووەم: ئەگەر کەسێك ڕۆشتە لای پزیشکێك و داوای پێشکەش کردنی شارەزایی لێ کردو. پزیشکەکەش گومانی تاوانکاری لە کەیسەکەدا کرد، بە تایبەت کەیسە سێکسیەکان، کە زۆرجار سەرچاوەی کێشە کۆمەڵایەتیەکانن، ئەگەر پزیشك ڕای خۆی نەربڕی و لایەنی دەستەڵاتداری ئاگادار نەکردەوە ئەوە بێگومان هەڵەی کردوەو، بەرپرسیارێتی تاوانکاری دەکەوێتە ئەستۆ، چونکە ڕەفتارەکەی پێچەوانەی دەقی یاساکانە.

## ژێدەر:


١ - د. عبدالمجيد الحكيم، د. عبدالباقى البكرى، د. محمد طه البشير، نظرية الالتزام فى القانون المدنى العراقى، العتك للطباعة، القاهرة، الطبعة الرابعة، ٢٠١٠، ص٢٠١-٢٠٢، لقمان فاروق حسن نانةكةلى، المسؤولية القانونية فى العمل الطبى، منشورات زين الحقوقية، الطبعة الاولى، ٢٠١٣، ص١٧٧.

٢ - عبدالحمن بن صالح الطيّار" المسئولية عن خطأ الطبيب فى دول الخليج العربى، جامعة نايف للعلوم الأمنية، الرياض، سنة ٢٠١٠، ص١١٨.

٣ - فريحة كمال" المسؤولية المدنية للطبيب، مذكرة لنيل شهادة الماجستير فى القانون الخاص، جامعة مولود معمرى - تيزى وزو، تأريخ المناقشة ٣٠/ ٩/ ٢٠١٢، ص١٦٥.

٤ - مختار الصحاح، ص١٧٩. المنجد، ١/٣٩س٩. القاموس المحيط، ١/٤١.

٥ - زين الدين احمد بن رجب الحنبلى" جامع العلوم والحكم، مكتبة الشرق الجديد، بغداد، مطبعة اوفست الوسام، بدون سنة طبع، ص٣٥٢.

٦ - لقمان فاروق حسن نانةكةلى، المسؤولية القانونية فى العمل الطبى دراسة مقارنة بين القانون والشريعة، منشورات زين الحقوقية، لبنان، الطبعة الأولى، ٢٠١٣، ص٣٢.

٧ - عبدالصبور عبدالقوى على مصرى، جرائم الأطباء والمسؤولية الجنائية والمدنية عن الأخطاء الطبية، دارالعلوم للنشر والتوزيع، القاهرة، الطبعة الأولى، ٢٠١١ ،ص١٤٦.

٨ - وائل تيسير محمد عساف، المسؤولية المدنية للطبيب دراسة مقارنة، رسالة لنيل درجة الماجستير، جامعة النجاح الوطنية، نابلس، سنة ٢٠٠٨، ص٥٩.

٩ - لقمان فاروق حسن نانةكةلى، سابقاً، ص٣٤.

١٠ - د. منصور عمر المعايطة" المسؤولية المدنية والجنائية فى الأخطاء الطبية، جامعة نايف العربية للعلوم الأمنية، الرياض، الطبعة الاولى، ٢٠٠٤، ص٤٧-٤٨.

١١ - د. طه عثمان ابوبكر المغربى، المسئولية الجنائية عن الاخطاء الطبية فى مجال التوليد، دار الفكر والقانون للنشر، المنصورة، مصر، ٢٠١٤، الطبعة الاولى، ص١٣٦.

١٢ - د. سميرة حسين محيسن، المسئولية المدنية لادارة المستشفى عن الخطأ الطبى للعاملين فيها، دارالفكر والقانون للنشر، مصر، الطبعة الاولى، ٢٠١٦، ص١٦١، فريحة كمال، المسؤولية المدنية للطبيب، جامعة مولود معمرى - تيزى وزو، الجزائر، سنة المناقشة ٢٠١٢، ص١٨٧.

١٣ – لقمان فاروق حسن نانةكةلى، سابق الاشارة اليه، ص٣٦-٣٧.

١٤ – فريحة كمال، سابق الاشارة اليه، ص١٨٨.

١٥ - شريف الطباخ، جرائم الخطأ الطبى والتعويض عنها، دارالفكر والقانون للنشر، المنصورة، مصر، ٢٠١١، الطبعة الاولى، ص١٤.

١٦ – د. منصور عمر المعايطة، سابق الاشارة اليه، ص٤٨.

١٧ – د. سميرة حسين محيسن، سابقاً، ص١٦٩-١٧٠. لقمان فاروق حسن نانةكةلى، سابقاً، ص١٧٠، د. منصور عمر المعايطة، سابقاً، ص٤٨-٤٩.

١٨ – د. أنور يوسف حسين، ركن الخطأ فى المسئولية المدنية للطبيب دراسة مقارنة، دار الفكر والقانون للنشر، المنصورة، مصر، ٢٠١٤، الطبعة الاولى. ص٢٨٥.

١٩ – د. عبدالمجيد الحكيم، ود. عبدالباقى البكرى، ود. محمد طه البشير، سابق الاشارة اليه، ص٢٨٥.

٢٠ – د. طه عثمان ابوبكر المغربي، سابق الاشارة اليه، ص١٢١-١٢٢.

٢١ – فريحة كمال، سابق الاشارة اليه، ص١٨٠.

٢٢ – د. عبدالمجيد الحكيم ود.عبدالباقى البكرى ود.محمد طه البشير، سابق الاشارة اليه، ص٢١٦.

٢٣ – د. سميرة حسين محيسن، المسئولية المدنية لادارة المستشفى عن الخطأ الطبى للعاملين فيها، دارالفكر والقانون للنشر، مصر، الطبعة الاولى، ٢٠١٦، ص٢٠٦-٢٠٧.

٢٤ - د. عبدالمجد الحكيم، و د. عبدالباقى البكرى، ود. محمد طه البشير، سابقاً، ص٢١٢.

٢٥ - د. طه عثمان ابوبكر المغربى، المسئولية الجنائية عن الاخطاء الطبية فى مجال التوليد، دار الفكر والقانون للنشر، المنصورة، مصر، ٢٠١٤، الطبعة الاولى، ص٣٠٠.

٢٦ - د. منصور عمر المعايطة، سابقاً، ص٥٥.

٢٧ – المصدر نفسه، ص٥٥-٥٦.

٢٨ – بدر محمد الزغيب، المسؤولية المدنية للطبيب عن الاخطاء الطبيية فى مجال التلقيح الصناعى، جامعة الشرق الاوسط، عمان، الاردن، سنة المناقشة ٢٠١١.. ص٥٤.

٢٩ - فريحة كمال، المسؤولية المدنية للطبيب، جامعة مولود معمرى – تيزى وزو، الجزائر، سنة المناقشة ٢٠١٢، ص٢٦٦.

٣٠ - د. منصور عمر المعايطة، سابقاً، ص٥٨.

٣١ – فريحة كمال، سابقاً، ص٢٦٦.

٣٢ – المصدر نفسه، ص٢٦٦.

٣٣ - د. منصور عمر المعايطة، سابقاً، ص٦٠.

٣٤ – فريحة كمال، سابقاً، ص٢٦٧، بدر محمد الزغيب، سابقاً، ص٥٦-٥٧.

٣٥ - د. عبدالمجيد الحكيم، ود. عبدالباقي البكري، ود. محمد طه البشير، سابقاً، ص٢١٣.

٣٦ - د. منصور عمر المعايطة، سابقاً، ص٥٧.

٣٧ – المصدر نفسه، ص٥٧.

٣٨ - د. عبدالمجيد الحكيم، ود. عبدالباقي البكري، ود. محمد طه البشير، سابقاً، ص٢١٣-٢١٤.

٣٩ – فريحة كمال، سابقاً، ص٢٨٧.

٤٠ - د. عبدالمجيد الحكيم، ود. عبدالباقي البكري، ود. محمد طه البشير، سابقاً، ص٢١٤.

٤١ – فريحة كمال، سابقاً، ص٢٨٣-٢٨٤.

٤٢ - د. منصور عمر المعايطة، سابقاً، ص٦١.

٤٣ - د. عبدالمجيد الحكيم، ود. عبدالباقي البكري، ود. محمد طه البشير، سابقاً، ص٢٣٩.

٤٤ - ناسوس نامق براخاس، قبول المخاطر الطبية واثره في المسؤلية المدنية دراسة تحليلية مقارنة، دارالكتب القانونية، القاهرة، ٢٠١٣، الطبعة الولى، ص١٦٣.

٤٥ - عباس على محمد الحسيني، مسؤولية الصيدلى المدنية عن أخطائه المهنية دراسة مقارنة، دار الثقافة للنشر، ١٩٩٩، الطبعة الاولى، ص٦٨، د. محمد جلال حسن الاتروشي، المسؤولية المدنية الناجمة عن عمليات نقل الدم دراسة مقارنة، دار الحامد للنشر والتوزيع، الاردن، ٢٠٠٧، الطبعة الاولى،ص١٦٣.

٤٦ - د. أنور يوسف حسين، ركن الخطأ في المسئولية المدنية للطبيب دراسة مقارنة، دار الفكر والقانون للنشر، المنصورة، مصر، ٢٠١٤، الطبعة الاولى، ص٣٦٩.

٤٧ - زياد خالد يوسف المفرجي، المسؤولية الادارية عن الاعمال الطبية دراسة مقارنة، منشورات زين الحقوقية، بيروت، لبنان، ٢٠١٦، الطبعة الاولى، ص٨٨.

**٤٨ – د. طه عثمان ابوبكر المغربي، سابقاً، ص١٥٣.**

**٤٩ – عباس علي محمد الحسيني، سابقاً، ص٧٠.**

**٥٠ - د. عبدالمجيد الحكيم، ود. عبدالباقي البكري، ود. محمد طه البشير، سابقاً، ص٢٣٩-٢٤٠.**

**٥١ – ئاسۆس نامق براخاص، سابقاً، ص١٦٦.**

**٥٢ – د. سميرة حسين محيسن، سابقاً، ص٢٤٠س.**

**٥٣ – المصدر نفسه، ص٢٤٩.**

**٥٤ – ابن قيّم الجوزية" الطب النبوي، دارنوبليس للنشر والتوزيع، بيروت، طبعة أولى، سنة ٢٠٠٧، ج٢، ص٢١٤. د.علي القرداغي و د.علي يوسف المحمدي" فقه القضايا الطبية المعاصرة، شركة دارالبشائر للطباعة والنشر، بيروت، لبنان، الطبعة الثانية، ٢٠٠٦، ص٩٦.**

**٥٥ – نائل محمد يحيى، المسئولية الجنائية عن خطأ التأديب والتطبيب دراسة فقهية مقارنة، جامعة الازهر، غزة، فلسطين، سنة التخرج ٢٠١٢، ص١٢٩-١٣٠.**

**٥٦ – زياد خالد يوسف المفرجي، المسؤولية الادارية عن الاعمال الطبية دراسة مقارنة، منشورات زين الحقوقية، بيروت، لبنان، ٢٠١٦، الطبعة الاولى. ص١٥.**

**٥٧ – د. منصور عمر المعايطة" المسؤولية المدنية والجنائية في الأخطاء الطبية، جامعة نايف العربية للعلوم الأمنية، الرياض، الطبعة الاولى، ٢٠٠٤، ص٤٤.**

**٥٨ – وائل تيسير محمد عساف، سابقاً، ص٦١-٦٢.**

**٥٩ – د. منصور عمر المعايطة" سابقاً، ص٤٣.**

**٦٠ – فريحة كمال" سابقاً، ص١٦٨.**

**٦١ – المصدر نفسه، ص١٦٨.**

**٦٢ – لقمان فاروق حسن نانةكةلي، سابقاً، ص٣٩.**

**٦٣ – عبدالصبور عبدالقوي علي مصري، جرائم الاطباء والمسؤولية الجنائية والمدنية عن الاخطاء الطبية، دار العلوم للنشر والتوزيع، القاهرة، الطبعة الاولى، ٢٠١١ ، ص١٤٧.**

٦٤ – د. عبدالمجيد الحكيم، د. عبدالباقي البكري، د. محمد طه البشير، الوجيز في نظرية الإلتزام في القانون المدني العراقي،الجزء الأول، مصادر الإلتزام، شركة العاتك لصناعة الكتاب، القاهرة، الطبعة الرابعة، سنة ٢٠١٠، ص٢١٥-٢١٨.

٦٥ – لقمان فاروق حسن نانةكةلي، سابقاً، ص٤٠-٤١.

٦٦ – المصدر نفسه، ص٤١.

٦٧ – زياد خالد يوسف المفرجي، سابقاً، ص٦٨.

٦٨ – لقمان فاروق حسن نانةكةلي، سابقاً، ص٤٤.

٦٩ – فريحة كمال، سابقاً، ١٧٣.

٧٠ – المصدر نفسه، ١٦٩.

٧١ – لقمان فاروق حسن نانةكةلي، سابق الاشارة اليه، ص٩٢.

٧٢ – المصدر نفسه، ص٤٩.

٧٣ - د. سميرة حسين محيسن، المسئولية المدنية لادارة المستشفى عن الخطأ الطبي للعاملين فيها دراسة مقارنة، دار الفكر والقانون للنشر، المنصورة، مصر، ٢٠١٦، الطبعة الاولى. ص٣٥-٣٦.

٧٤ – لقمان فاروق حسن نانةكةلي، سابقاً، ص٥٢.

٧٥ – زياد خالد يوسف المفرجي، سابق الاشارة اليه، ص٦٩.

٧٦ – المصدر نفسه، ص٧٠.

٧٧ - غضبان نبيلة، المسؤولية الجنائية للطبيب، جامعة مولود معمري – تيزي وزو، سنة المناقشة ٢٠٠٩. ص٢٤-٤١، د.منصور عمر المعايطة، سابق الاشارة اليه، ص٨-١١، لقمان فاروق حسن نانةكةلي، سابق الاشارة اليه، ص٥٥-٨٠، رائل تيسير محمد عساف، سابقاً، ص٢٣-٣٢.

٧٨ – سايكي وزنة، اثبات الخطأ الطبي امام القاضي المدني، جامعة مولود معمري، الجزائر، ٢٠١٠-٢٠١١، ص٣١-٣٢.

٧٩ – المصدر نفسه، ص٣٣.

٨٠ – شارف رحمة، المسؤولية الادارية عن الاخطاء الطبية، جامعة محمد خيضر بسكرة، الجزائر، سنة المناقشة ٢٠١٣-٢٠١٤، ص١٥-١٦.

٨١ - د. رمزى رشاد عبدالرحمن الشيخ، المسئولية المدنية للطبيب عن عمليات نقل وزراعة الاعضاء، دار الجامعة الجديدة للنشر، مصر، ٢٠١٥، ص١٣١-١٣٢س

٨٢ - ناسؤس نامق براخاس، قبول المخاطر الطبية واثره فى المسؤلية المدنية دراسة تحليلية مقارنة، دارالكتب القانونية، القاهرة، ٢٠١٣، الطبعة الولى، ص٥٥.

٨٣ – المصدر نفسه، ص٦٣.

٨٤ - د. حسين عبدالصاحب الربيعى، جرائم الاعتداء على حق الانسان فى التكامل الجسدى (دراسة مقارنة)، شركة العاتك لصناعة الكتاب، القاهرة، ٢٠١١، الطبعة الاولى، ص٣١.

٨٥ – ناسؤس نامق براخاص، سابقاً، ص٣٨.

٨٦ – سايكى وزنة، سابقاً، ص٣٩.

٨٧ – د. سميرة حسين محيسن، سابقاً، ص١٧٨، عبدالصبور عبدالقوى على مصرى، سابقاً، ص١٦١.

٨٨ – د. سميرة حسين محيسن، سابقاً، ص١٧٩، شارف رحمة، سابقاً، ص١٧.

٨٩ – د. سميرة حسين محيسن، سابقاً، ص١٨٠.

٩٠ - شارف رحمة، المسؤليةَ الادارية عن الاخطاء الطبية، جامعة محمد خيضر بسكرة، الجزائر، ٢٠١٣-٢٠١٤، ص١٧-١٨.

٩١ – د. سميرة حسين محيسن، سابقاً، ص١٨٠، سايكى وزنة، سابقاً، ص٤٤.

٩٢ – بدر محمد الزغيب، سابقاً، ص٤٨.

٩٣ – د. سميرة حسين محيسن، سابقاً، ص١٨٠-١٨١.

٩٤ - عبدالصبور عبدالقوى على مصرى، سابقاً، ص١٦٦، فريحة كمال، سابقاً، ص١١١.

٩٥ – وائل تيسير محمد عساف، سابقاً، ص٨٠.

٩٦ – د. أنور يوسف حسين، سابقاً، ص١٨٨، د. طه عثمان ابوبكر المغربى، سابقاً، ص٢٠٢.

٩٧ - د. طه عثمان ابوبكر المغربى، سابقاً، ص٢٠٣، لقمان فاروق حسن نانةكةلر، سابقاً، ص١٦٩.

٩٨ – د. سميرة حسين محيسن، سابقاً، ص١٨٥.

٩٩ – سمير عبدالسميع الاودن، المسئولية القانونية للطبيب والمستشفى والصيدلى، الناشر منشأة المعارف، الاسكندرية، مصر، ٢٠١١، الطبعة الاولى، ص٧٥، بدر محمد الزغيب، سابقاً، ص٤٨-٤٩.

١٠٠ – د. سميرة حسين محيسن، سابقاً ص١٨١.

١٠١ – المصدر نفسه، ص١٨٢-١٨٤.

١٠٢ – سايكى وزنة، سابقاً ص٤٦.

١٠٣ – عبدالصبور عبدالقوى على مصرى، سابقاً، ص١٦٩-١٧١، شريف الطباخ، سابقاً، ص٣٨.

١٠٤ – د. د.عبدالمجيد الحكيم ود.عبدالباقى البكرى و د.محمد طه البشير، سابق الاشارة اليه، ص٨٠، سايكى وزنة، إثبات الخطأ الطبى أمام القاضى المدنى، جامعة مولود معمرى ـ تيزى وزو، الجزائر، ٢٠١٠-٢٠١١، ص١٧.

١٠٥ – د. أنور يوسف حسين، سابق الاشارة اليه، ص٣٠٦.

١٠٦ – المصدر نفسه، ص٣٠٥.

١٠٧ – سايكى وزنة، سابقاً، ص١٨.

١٠٨ – سايكى وزنة، سابقاً، ص١٨، د. أنور يوسف حسين، سابقاً، ص٣٠٦.

١٠٩ - سايكى وزنة، سابقاً، ص١٨، د. أنور يوسف حسين، سابقاً، ص٣٠٧، سميرة حسين محيسن، سابقاً، ص١٨٤.

١١٠ – فريحة كمال، سابقاً، ص١٧٧.

١١١ – المصدر نفسه، ص١٧٨.

١١٢ – د. سميرة حسين محيسن، سابقاً، ص١٨٤.

١١٣ – د. أنور يوسف حسين، سابقاً، ص٣٠٩، و بدر محمد الزغيب، المسؤولية المدنية للطبيب عن الاخطاء الطببية فى مجال التلقيح الصناعى، جامعة الشرق الاوسط، عمان، الاردن، سنة المناقشة ٢٠١١، ص٣٧.

١١٤ – د. طه عثمان ابوبكر المغربى، سابقاً، ص٢٠٠.

١١٥ – د. سميرة حسين محيسن، سابقاً، ص١٨٥-١٨٩.

١١٦ – د. أنور شريف حسين، سابقاً، ص١٨٨، سايكى وزنة، سابقاً، ص٤٧-٤٨.

١١٧ – د. سمير عبدالسميع الاودن، سابقاً، ص٧٦-٧٧.

١١٨ – وائل تيسير محمد عساف، سابقا، ص٨٥-٨٧.

١١٩ – د. سميرة حسين محيسن، سابقاً، ص١٩٣.

١٢٠ – د. منصور عمر المعايطة، سابقاً، ص٧٨-٧٩.

١٢١ – عبدالصبور عبدالقوي علي مصري، سابقاً، ص١٧٥.

١٢٢ - د. منصور عمر المعايطة، سابقاً، ص٨٠، عبدالصبور عبدالقوي علي مصري، سابقاً، ص١٧٨، د. سميرة حسين محيسن، سابقاً، ص٢٠٠، شريف الطباخ، سابقاً، ص٥١.

١٢٣ – د. احمد سلمان شهيب، عقد العلاج الطبي، مكتبة السنهوري، بغداد، الطبعة الاولى، ٢٠١٢، ص٢٢٩.

١٢٤ - د. ابراهيم احمد محمد الرواشدة، المسؤولية المدنية لطبيب التخدير دراسة مقارنة، دارالكتب القانونية للنشر، مصر، ٢٠١٠، الطبعة الاولى، ص٦٩.

١٢٥ - القاضي سردار عزيز خوشناو، التشريعات العقابية في القوانين العراقية الجزء الاول، مطبعة منارة، اربيل، ٢٠١٠، ص٥٤-٥٩.

١٢٦ – د. ابراهيم احمد محمد الرواشدة، سابقاً، ص٧٧-٨٦، سميرة حسين محيسن، سابقاً، ص٢٠٠، د. أنور شريف حسين، سابقاً، ص٢٠٣ .

١٢٧ – د. سميرة حسين محيسن، سابقاً، ص٢٠٣.

١٢٨ – فريجة كمال، سابقاً، ص١١٩، سايكي وزنة، سابقاً، ص٥٠.

١٢٩ – د. أنور شريف حسين، سابقاً، ص٢٠١-٢٠٢.

١٣٠ – المستشار منير رياض حنّا، الطب الشرعي، دارالفكر الجامعي، الاسكندرية، مصر، الطبعة الاولى، سنة٢٠١، ص١٥.

١٣١ – المصدر نفسه، ص١٧.

١٣٢ – عبدالصبور عبدالقوي علي مصري، سابقاً، ص٣٣١.

# باسی یەكەم

# پابەندیەكانی پزیشك

## لقی یەكەم

## سروشتی پابەندبوونی پزیشك

**یەكەم: پێناسەو گرنگی و سروشتی پابەندبوون:**

**١ – پێناسە:** ماددەی (٦٩)ی یاسای شارستانی عێراقی پابەندبوون بەم شێوە پێناسە دەكات: ﴿ مافی كەسیی پابەندبوونێكی یاساییە لە نێوان دوو كەسدا، خاوەن قەرزو قەرزار، بە پێی ئەو پەیوەندیە خاوەن قەرز داوا دەكات قەرزار مافێكی عەینی –سامان و دارایی– بۆ بگوێزێتەوە، یان كردارێك ئەنجام بدات، یان وازبێنێ لە كردنی كردارێك﴾. پابەندبوون پەیوەندیەكی یاساییە، بە هۆی ئەو پەیوەندیەوەو، بە یارمەتی دەستەڵاتی گشی یەوە لە كاتی پێویستدا قەرزار ناچار دەكرێت بە جێبەجێ كردنی پابەندبوونەكەی.

ئەگەر لە لایەنی خاوەن قەرزەوە سەیری ئەو پەیوەندیە بكەین پێی دەوترێ مافی كەسیی، بەڵام ئەگەر لە لایەنی قەرزارەوە سەیر بكرێت پێی دەوترێ پابەندبوون. [1].

**٢ – گرنگیی تیۆری پابەندبوون:**

واباوە لە لێكۆڵینەوەی مافی كەسیدا هەمیشە لە لایەنی قەرزارەوە سەیر دەكرێت، واتە لێكۆڵینەوە لە پابەندبوون دەكرێت، ئەوەش بۆ ئەو ڕۆڵە سەرەكیە دەگەڕێتەوە كە قەرزار دەیگێڕێ، چ لە بونی پابەندبووندا یان لە جێبەجێ كردنیدا ... تیۆری پابەندبوون لە جیهانی یاسادا لە لایەنی پراكتیكیو زانستیشەوە گرنگیەكی گەورەی هەیە، تیۆری پابەندبوون بە بڕبڕەی یاسا دادەنرێت بۆ یاساكان بە گشتیو، بۆ یاسای شارستانی بەتایبەت، لە لایەنی پراكتیكیەوە زۆربەی هەڵسوكەوتی ڕۆژانەمان بریتیە لە گرێبەستێك پابەندبوونی لێ دەكەوێتەوە، وەك كڕین و فرۆشتن. ڕۆژانە ڕوداو ڕوودەداتو، بەرپرسیارێتی دروست دەكات. [2].

٣ – سروشتی پابەندبوونی پزیشك:

زانستی پزیشکی کە پەیوەندارە بە جەستەی مرۆڤەوەو، ئەو پێشکەوتنەی بە خۆیەوە بینیوە بەرپرسیارێتی پزیشکی کردوە بە کارێکی بایەخدارو مەترسیداریش... بە تایبەت لەو بارانەدا نەخۆش چاك نابێتەوە، یان نەخۆشیەکەی زیاتر دەبێت‌و تەشەنە دەکات، دیارە ئەوەش پەیوەندی بە پاراستنی لاشەی مرۆڤەوە هەیەو، ئەنجامەکەی کۆمەڵێك کێشەی زانستی‌و یاسایی لە نێوان نەخۆش‌و پزیشکدا دروست دەکات، بە تایبەت لە بارەی ئاستی پابەندبوونی پزیشك لەو کردارو هەڵسوکەوتەی لەگەڵ نەخۆشدا کردویەتی‌و، ئەو ئەنجامە چاوەنوارِ نەکراوە ڕویداوە کە چاکنەبوونەوەی نەخۆشە، لە هەندێك کاتدا دەستێوەردانی پزیشك زیانی گەورەتر بە جەستە دەگەیەنێت، ئەمەش سەری بۆ ئەوە کێشا بۆ دروستکردنی هاوسەنگی نێوان پزیشك‌و نەخۆش یاساو دادوەری بێنە ناوەوە، لە لایەکەوە بۆ پارێزگاری لاشەی مرۆڤ، لە لایەکی دیکەوە دروستبوونی بەرپرسیارێتی پزیشك، ئەگەر سەلمێنرا لە ئەنجامدانی ئەرکەکەیدا کەمتەرخەمی‌و درێخی کردوە. (٣).

٤ – جیاوازیکردن لە نێوان پابەندبوونی بە ئەنجام گەیاندن‌و پابەندبوون بە هۆکار:

بەرپرسیارێتی گرێبەستی پابەندبونێکی دیاریکراو بە سەر لایەنەکانی گرێبەستەکەدا دەسەپێنێ، یاساناسان ناوەرۆکی ئەم گرێبەستەیان دابەش کردوە بۆ پابەندبوونی بەئەنجام گەیاندن (تحقیق النتیجە)و، پابەندبوون بە توانا بەکارهێنان یان هۆکار (الوسیلە)، لەوانەیە قەرزار پابەند بێت بە ئەنجامدانی پابەندیەکی سنوردار بۆ خاوەن قەرز، یان پابەند بێت بە بەکارهێنانی توانای ئەگەرچی نەگات بە ئەنجامیش، بەم جۆرە پابەندبوونە دەوترێ پابەندبوون بە هۆکار (الالتزام بالوسیلة).پابەندبوونی پزیشك لە پابەندبوونی ئەوانی تر جیاوازە، چونکە سروشتی کاری پزیشکی ئەوە ناخوازێت ئەنجامێکی دیاریکراو جێبەجێ ببێت کە چاکبونەوەی نەخۆشە، بەڵکو کاری پزیشك هەوڵدانی تەواوو بە خەرجدانی تواناو، نوسینی دەرمانە، ڕۆڵی پزیشك سوککردنی نەخۆشی‌و لابردنی ئازارە ... لێرەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە پابەندبوونی پزیشك وەك بنەمایەکی گشتی پابەندبوونە بە بەکارهێنانی هۆکار، نەك بەدەستهێنانی ئەنجام. بەڵام جیاواز لە بنەما گشتی یەکە هەندێك کاری پزیشکی هەن دەبێت بگەن بە ئەنجام‌و، تەنیا بەکارهێنانی تواناو هۆکار بەس نین. (٤).

**دووەم: پابەندبوون بە هۆکارەوە (الوسيلة):**

مەبەست لە پابەندبوون بە هەوڵدانی تەواوەوە ئەوەیە، کەسی پابەند ناچار ناکرێت ئەنجامێکی سنوردار بەدەست بێنیٚ، بەڵکو دەبێت هەوڵ و توانای خۆی بخاتە کار، ئەگەر مەبەستی تایبەت نەهاتەدی کەسی پابەند بە هەڵەو پێشێلکار دانانرێت، چونکە لە بنەڕەتدا پابەند نییە بە ئەنجام گەیاندن، بەڵکو کاتێك بە هەڵەو پێشێلکار دادەنرێت کە بسەلمێنریٚ هەوڵی تەواوی نەداوە. [٥].

کۆدەنگیەك لە نێوان دادوەریی و یاساناساندا هەیە کە گرێبەستی چارەسەرکردن لە بنەمادا وا دەخوازێت کاتێك پزیشك مومارەسەی پیشەکەی دەکات هەولٚ بدات ئازارەکانی نەخۆش کەم بکاتەوە، نەك پابەند بێت بە چاککردنەوە، ئەگەر پزیشك لە کارەکەیدا پابەند بێت بە ڕێسا گشتیەکانەوەو، سەلماندی هەوڵی تەواوی داوە ئەوکات ئەستۆی پاك دەبێت، ئەگەرچی ئەنجامی پێویستیش بە دەست نەهێنێت. چونکە چاکبونەوە پەیوەندی بە کۆمەڵێك فاکتەرەوە هەیە کە لە ژێر کۆنترۆڵی پزیشکدا نییە، لەو فاکتەرانە وەك: توانای بەرگری لاشە، بۆماوە، سنورو ئاستی زانستی و هونەری پزیشك. بۆیە پزیشك پابەند نابێت بە ڕێگرتن لە مردنی نەخۆش. [٦].

لە کاری پزیشکیدا چەندین فاکتەر هەن هەموو کات ناچنە ژێر باری ویستی پزیشکەوە، لە دادوەریدا سەلمێنراوە ئەگەر پزیشك سەرکەوتوو نەبوو لە چاکبونەوەی نەخۆشدا بەرپرسیارێتی ناکەوێتە ئەستۆ، چونکە لە گرێبەستی چارەسەر کردندا پزیشك بەڵێنی ئەوە نادات نەخۆشەکە چاك بکاتەوە، بەڵکو هەموو پابەندیەکی پزیشك هەوڵدانی تەواویەتی بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشەکە نەك چاکبونەوەی، چونکە چاکبونەوەی نەخۆش هەمیشە لە ژێر کۆنترۆڵی پزیشکدا نییە، بەڵکو فاکتەری دی کاریگەرن تیایدا وەك بۆماوەیی، ئامادەیی لاشە بۆ نەخۆشی، ئاستی بڵاوبونەوەی نەخۆشیەکە لە لاشەدا. [٧].

زانای پایەبەرز سەنهوری دەڵیٚ: ( پابەندبونی پزیشك بە چارەسەرکردنی نەخۆش پابەندبوونی گەشتن بە ئەنجام نییە کە چاکبونەوەی نەخۆشە، بەڵکو پابەندبونە بە هەوڵدانی تەواو بە گوێرەی ئەوەی پیشەی پزیشکی پێویستی کردوە). [٨].

**سێیەم : پابەندبوونی بە ئەنجام گەیاندن ( تحقیق النتیجة):**

ئەگەرچی لە بنەڕەتدا پابەندبوونی پزیشك پابەندبوونە بە هەوڵدانی تەواوو بە خەرجدانی توانا، بەڵام لە هەندێك باردا پابەندبوونێکی سنوردار دەکەوێتە ئەستۆی پزیشك کە پابەندبوونە بە ئەنجام گەیاندن وەك پارێزگاری لە سەلامەتی نەخۆش نەك چاکبوونەوە، پابەندبوونە بەوەی ئەو ئامێرانەی بەکاری دێنێ یان ئەو دەرمانەی دەیداتێ ئازار نەگەیەنێ بە نەخۆشەکە، پابەندە بەوەی ئەو جێگایەی نەخۆشی تێدا دەخەوێنرێ پاکژ بێت و نەخۆشی و درم نەگوێزرێتەوە بۆ نەخۆشەکە، پابەندە بەوەی لە گواستنەوەی خوێندا نەخۆشی نەگوێزرێتەوە بۆ نەخۆشەکە. [٩].

هەوڵدەدەین لەم بەشەی خوارەوەدا ئەو بابەتانە دیاری بکەین کە پابەندبوونی بە ئەنجام گەیاندن دەخاتە ئەستۆی پزیشكو، هەڵاوێراوە (استثناء) لە ڕێسا گشتیەکە، هەرکات پزیشك کارەکەی نەگەیاند بە ئەنجامو مەبەستی دیاریکراو، ئەوا بەرپرسیارێتی دەکەوێتە ئەستۆ. پێشتر ڕونمان کردەوە پابەندبوونی پزیشك لە بنەڕەتدا پابەندبوونە بە هۆکارەوە، بەڵام بەهۆی بیرۆکەی ئەو گریمانەیەی بۆ ئەنجامی ئەرکی پزیشك دروست دەبێت هیچ ڕێگریەك نیە لە هەندێك حاڵەتی هەڵاوێراودا پابەندبوونێکی سنوردار بکەوێتە ئەستۆی پزیشك کە گەشتنە بە ئەنجامو مەبەست، لەم پابەندبوونە سنوردارەدا بوار نامێنێتەوە بۆ بیرۆکەی گریمانەکان تا بکرێنە بیانوو بۆ قەتیسکردنی پابەندی پزیشك لە هۆکار و توانا بەخەرج داندا. [١٠].

پابەندبوونی پزیشك تەنیا لە توانا بەخەرجداندا قەتیس نەماوە، بەڵکو کارەکە گۆڕاوە بۆ پابەندبوونی گەشتن بە مەبەست و ئەنجام، لەوانە پاراستنی سەلامەتی نەخۆشو، دروستی کارە پزیشکیەکان، بە سەرنجدان لەو پێشکەوتنەی زانستی پزیشکیی پێیگەشتووە، گریمانە هەموو کارە پزیشکیەکان ناگرێتەوە، نموونەی ئەو حاڵەتانەی پابەند بوونی پزیشك تێیدا گەشتن بەمەبەستە: شیکارە تاقیگەیەکان، پرۆسەی گواستنەوەی خوێن، بە کارهێنانی ئامێرە پزیشکیاکان. [١١].

پابەندبوونی پزیشك بە گەشتن بە مەبەست لە پرەنسیپە گشتیە هەڵاوێراوەکانە، بە سەرنجدانی ئەم خاڵانە:

**خاڵی یەکەم: ڕێکەوتنی دوولایەن:**

دەکرێت لە میانەی گرێبەستێکی نێوان پزیشك و نەخۆشەوە دروست ببێت، ئەو گرێبەستە لەسەر بناغەی گەشتن بە مەبەست و ئەنجام ببەسترێتو، هەرکات پزیشك ئامانجەکەی نەپێکا ئەوە بەهەڵە دادەنرێتو، بەرپرسیارێتی دەکەوێتە ئەستۆ.

**خاڵی دووەم: دەبێت پزیشك پابەندبێت بە ئەنجامێکی سنووردار:**

دادوەریی دەستەبەری سەلامەتی نەخۆشی دابین کردووە، بۆیە دەبێت نەخۆشخانە وریای ئەو زیانانەبێت کە لەوانەیە لە خواردن، یان خواردنەوە، یان پاکوخاوێنی، یان پەتا لە ڕێی نەخۆشخانەکەوە بەر نەخۆش بکەوێت.[١٢]

## لقی دووەم

## ئەو کارە پزیشکیانەی پابەندبوون تیایاندا بەئەنجام گەیاندنە

بە هۆی پێشکەوتنە زانستیە خێراکانەوە ناکرێت پابەندبوونەکان وەك خۆیان بمێننەوە، چونکە لەوانەیە پێش چەند ساڵێك جۆرێکی پابەندی پزیشکی بە خەرجدانی توانا بوبێت، بەڵام ئەمڕۆ تەکنەلۆژیا پێشکەوتبێتو بتوانێت بە وردی دەستیشانی نەخۆشیەکە بکات، بۆیە پابەندبوونی پزیشکیش تیایدا دەبێت بە گەشتن بە مەبەست. لە خوارەوە ئەو کارە پزیشکیانە باس دەکەین کە پزیشك پابەندە بە ئەنجام گەیاندنیانو، هەرکات مەبەستی دیاریکراو نەهاتەدی پزیشك بە هەڵە دادەنرێتو بەرپرسیارێتی دەکەوێتە ئەستۆ.

**یەکەم: شیکارە تاقیگەیەکان:**

پێشکەوتنە زانستیەکانی بواری شیکاری تاقیگەیی وایکردووە لە شیکاری نەخۆشیدا گریمانە نەمێنێت، بەڵکو ئەنجامەکان ورد و سنووردارن، ئەگەر کەسەکە لە کارەکەیدا کەمتەرخەمی نەکات، یاسا ناسان بە گشتیو دادوەریی فەرەنسیش لەسەر ئەوەن پابەندبوونی پزیشکی شیکار پابەندبوونی گەشتن بە ئەنجامە، هەر هەڵەیەك ڕوبدات پزیشك بەرپرسیارە بە بێ سەلماندنی هەڵەی پزیشك، کاتێك پزیشك لە بەرپرسیارێتی ڕزگاری دەبێت بیسەلمێنێت هەڵەکە بە هۆیەکی دەرەکی ڕوویداوە.[١٣]

ئەگەر ئەنجامی پشکنینەکە دروست نەبوو، وا دادەنرێت هەڵەی پزیشکە، چونکە لەو کارانەدا پابەندبوون گەشتن بە ئەنجامە.(١٤)

شیکارەکان بە پرۆسەیەکی ئاسایی دادەنرێن‌و، دەکەونە سەر پێگەیەکی سنوردارو، هیچ گریمانەیەک‌و گرانیەک لە خۆ ناگرن، ئیتر جۆری شیکاریەکە هەر جۆرێک بێت، ئەو پزیشکەی شیکارەکە دەکات تەنیا پابەندی ئەوە نییە چەندە دەزانێت ئەوەندە پێشکەش بکات، بەڵکو پابەند دەبێت بە ڕادەستکردنی ئەنجامێکی ڕوون‌و دیاریکراو، لە بەر ئەوە کاری شیکاری پابەندبونی گەشتن بە ئەنجام دەخاتە ئەستۆی پزیشک.(١٥)

لە کەیسێکدا ئەمە پوختەکەیەتی: ژن و مێردێک لە ساڵی ١٩٦٦ لە فەرەنسا هاوسەرگیریان کرد، پاشان منداڵێکیان بوو، لە ساڵی ١٩٨٥ توشی ڕووداوێک بوون کوڕە تاقانەکەیان لە تەمەنی شانزە ساڵیدا مرد، پاش ماوەیەک بڕیارياندا منداڵێکیان ببێت، بەڵام لەبەر ئەوەی تەمەنی ژنەکە چل‌ودوو ساڵ بوو، لە ترسی بوونی نەخۆشی بۆماوەیی لە منداڵەکەیاندا ژنەکە ڕۆشتە سەنتەری پزیشکی هەرێمی لە شاری (نیس) بۆ پشکنین، لەو کاتەدا تەمەنی سکەکەی لە چوار مانگ زیاتر بوو، لە کانونی یەکەمی ساڵی١٩٨٦ پشکنینی پێویست بۆ ژنەکەو کۆرپەلەکە کرا، ( لە چەند خانەیەکی کۆرپەلەکە شیکاری کرۆمۆسۆماتی بۆ کرا)، ئەنجامەکەی کۆرپەلەکە هیچ نەخۆشیەکی مەنگۆلی تێدا نەبوو، کە گومانیان لە بوونی هەبوو، چونکە لەگەڵ بەرەو پێشچوونی تەمەنی دایک ڕێژەی توشبونی کۆرپەلە بە مەنگۆلی زیاتر دەبێت، لە تەمەنی چل ساڵیدا ڕێژەی تووشبوون لە هەر سەد منداڵدا یەکە ١٪، پاش ئەوەی لە ١٩٨٧/١/٥دا ڕاپۆرتی پشکنینەکان دووپاتی ئەوەی کردەوە کۆرپەلەکە نەخۆش نییەو، ڕێژەی سەرکەوتن لە پشکنینەکەدا ٩٩،٩٪. دوو هاوسەرەکە دڵنیابوون‌و، سکەکە گەشتە ماوەی خۆی، لە ١٩٨٧/٤/٢٨ ژنەکە کوڕێکی بوو، ناویان لێنا (ماتین)، بەڵام ئەوەی ڕویدا منداڵەکە مەنگۆل بوو، لە کاتێکدا پشکنینەکان دووپاتی نەبونی نەخۆشیان کردبویەوە، دوو هاوسەرەکە داوای قەرەبوکردنەوەیان دژی سەنتەری ناوبراو کە پشکنین‌و شیکارە پێشوەکانی کردبوو بەرز کردەوە. کە سەلما سەنتەرەکە هەڵەی کردبوو لە ئەنجامە ڕادەستکراوەکەدا ئەوەش زیانی ماددی و مەعنەوی بۆ خۆیان‌و منداڵەکەیان لێکەوتەوە، دادگای (نیس) داوای قەرەبوو کردنەوەی پەرچدایەوە بە ناوی ئەوەی هەڵەی گەورە لە کارەکەدا ڕوینەداوە، بەڵام لە تێهەڵچوونەوەی بڕیارەکە لە دادگای کارگێڕی (لیۆن) لە ١٩٩١/١١/٢١ فەرمانی دەرکرد بە

بەرپرسیاریێتی سەنتەرە پزیشکیەکە لەو زیانانەی ڕویداوە پاش تانەدان لە بڕیارەکە دادگای لیۆن لە ئەنجومەنی دەوڵەت بڕیاریدا: بوونی پەیوەندی هۆیەتی ڕاستەوخۆ سەلماوە لە نێوان هەڵەی سەنتەری پزیشکی هەرێمی لە (نیس) لە شیکارکردنەکەداو، ئەو زیانەی لە هاوسەرەکانو منداڵەکەیان کەوتووە لە ئەنجامی ئەو نەخۆشییە کە سەنتەرەکە لە شیکارەکەیدا دووپاتی نەبوونی هەموو نەخۆشییەکی کردەوە بەبێ ئاماژەکردن بۆ بوونی ڕێژەیەکی هەڵە لە شیکارەکەیدا، هاوسەرەکان ئاگادار نەبوون لە هەڵەی ئەنجامەکە، بێگومان ئەوەش هەڵەیەکە سەنتەرەکە کردوویەتی، لەکاتێکدا ئارەزوی هاوسەرەکان بۆ لەباربردنی کۆرپەلەکە یاساییە، چونکە یاسای تەندروستی گشتی لە ماددەی ١٢/١٦٢ بۆ هۆکاری چارەسەرکردن ڕێگەی داوە بە لەباربردن، سەنتەرەکە ئەو هەلەی لە دەستدان، ئەنجامەکەش منداڵێکی لێکەوتەوە نەخۆشییەکی زگماکی هەمیشەیی هەیە، لە کاتێکدا ئەو پەککەوتەیە پێویستی تایبەتەو، ئەم بارەش بە درێژایی ژیانی دەخایەنێت، -دادگا- بڕیاریدا داهاتێکی بەردەوامی بۆ بڕیەوە مانگانە بڕی (٥٠٠٠) فرەنك بوو، بەڵام بۆ قەرەبوکردنەوەی ئەو زیانەی بە منداڵەکە گەشتووە داواکەی پەرچدایەوە، چەنکە دەرنەکەوتووە هەڵەی ئەنجامی شیکارییەکە هۆی ڕاستەوخۆی ئەو تووشبوونە بێت، بەڵکو لە خراپی بۆماوەیی دروست بووە نەك لە شیکارییەکەوە.[١٦]

دووەم: گواستنەوەی خوێن:

پرۆسەی گواستنەوەی خوێن لە کەسێکەوە بۆ یەکێکی تر شۆڕشێکی بواری زانستی بوو، بە هۆی ئەم تەکنیکە پزیشکیەوە ژیانی خەڵکانێکی زۆر لە مردن ڕزگار کراوەو دەکرێت، گرنگی ئەم تەکنیکە لەوەدا زیاتر دەبێت کە تائێستاش زانایان ئەڵتەرناتیڤێکی دیکەیان نەدۆزیوەتەوە جێی خوێن بگرێتەوە.[١٧]

ئەم پرۆسەیە دەخوازێت کەسێك هەبێت خوێنی لێوەربگیرێت پێی دەگوترێت (بەخشەر)و. کەسێکی دیکە خوێنی بۆ دەگوێزرێتەوە پێی دەگوترێت (وەرگر)، دەبێت شیکاری خوێن بۆ هەردووکیان بکرێت گروپەکەیانو جۆرەکەیان لەگەڵ یەکدا گونجاو بێت، هیچ نەخۆشیەکی تێدا نەبێت ئەمەش کەسی پسپۆڕ ئەنجامی دەدات، بە تایبەت پاش دۆزینەوەی نەخۆشی (ئایدز) کۆت و بەندی توندی بۆ دانراوەو دیسپلین کراوە، هەموو ئەوانەش لە پێناو پاراستنی سەلامەتی مرۆڤەکانە.[١٨]

پرۆسەی گواستنەوەی خوێن لەو بوارانەیە پزیشك تیایدا پابەند دەبێت بە گەشتن بە ئەنجام ...

دەبێت خوێنەکان لە هەمان گروپو هەمان جۆر بنو گونجاو بنو خوێنی بەخشەر نەخۆشی تێدا نەبێت، لەم بارەدا پزیشك پابەندیەکی دیاریکراو و سنورداری لەسەرە.[19]

پزیشکی چارەسەرکار بەڵێنی پابەندبوونێکی سنوردار دەدات بە پێشکەشکردنی خوێنێکی گونجاو و پاكو دروست، ئەگەر خوێنەکە گونجاو نەبوو، یان پیسبوو بە نەخۆشی لەو کاتەدا پزیشك بە پێشێلکار دادەنرێتو، بەرپرسیار دەبێت لە هەر زیانێك لە نەخۆشەکە دەکەوێت، یان هەر نەخۆشییەك تووشی دەبێت، مەگەر بیسەلمێنێ بە هۆیەکی دەرەکییەوە بووە ئەمەش مانای وانییە لە ئەنجامی گواستنەوەی خوێن نەخۆشەکە چاك ببێتەوە، بەڵکو پابەندە بەوەی خوێنە گواستراوەکە نەخۆشییەکی نویٚ تووشی نەخۆشەکە نەکات.[20]

پابەندی پزیشك بەرامبەر ئەو کەسەی خوێنی بۆ دەگوێزرێتەوە پابەندی بەئەنجام گەیاندنە، چونکە ئەم بوارە هێندە پێشکەوتووە هەڵە هەڵناگرێ، بە هیچ شێوەیەك مەبەستمان ئەوە نییە پزیشك بەرپرسبێت لە چاکبونەوەی نەخۆش، بەڵکو گرەنتی ئەوە دەدات بە هۆی ئەو خوێنەوە زیانی زۆرتر ڕونەدات.[21]

ئەنجومەنی دەوڵەتی فەرەنسی بەرپرسیارێتی خستە سەر سەنتەرەکانی گواستنەوەی خوێن ئەگەرچی هەڵەشیان نەکردبێت. لە بڕیارێکدا لە ١٩٩٥/٥/٢٦: « بە سەرنجدان لەو ئەرکەی یاسا خستویەتیە ئەستۆی ئەو سەنتەرانەو، ئەو مەترسیانەی لە بەرهەمەکانی خوێندا هەیە، سەنتەرەکانی گواستنەوەی خوێن بەرپرسیارن لە ئەنجامە زیانبەخشەکانی بەرهەمەکانیان ئەگەر هەڵەشیان نەکردبێت.[22]

**سێیەم: بەکارهێنانی کەلوپەلو ئامێرە پزیشکیەکان:**

پێشکەوتنی زانستی لە هەموو بوارە پزیشکیە جیاوازەکاندا وایکردوە لە کاتی چارەسەر کردنو نەشتەرگەریدا چەندین جۆر ئامێرو کەلوپەل بەکاربهێنرێت، لەوانەیە لە ئەنجامی بەکارهێنانی ئەو ئامێرانەدا زیان بە نەخۆش بگات ... لەگەڵ سەرهەڵدانی پرەنسیپی

پابەندبوونی پزیشك بە دەستەبەرکردنی پاراستنی نەخۆش لەو زیانانەی لەوانەیە لێی بکەوێت، جیا لەو نەخۆشیەی پێوەی دەناڵێنێ، لێرەدا پزیشك پابەندە بە ئەنجام گەیاندن، قەزاو فقهی نوێ لەسەر ئەو ڕایەن ئەو ئامێرانە بەکار دەهێنرێن پابەندبوون پێیانەوە بە ئەنجام گەیاندنە _ واتە هەر زیانێك لەو ئامێرانە دەکەوێتەوە پزیشك لێی بەرپرسیارە-.[٢٣]. لەگەڵ زۆربوونی بەکارهێنانی ئامێرەکان لە بواری کاری پزیشکیدا، پزیشك ناچار دەکرێت بەرپرسیارێتی ئەو زیانانە لە ئەستۆ بگرێت کە لەو کەلوپەلانەوە دروست دەبن کە لە ژێردەستی ئەودان.[٢٤].

هەرچەند لە پرۆسەی چارەسەر کردن‌و نەشتەرگەریدا پزیشك ئامێرو کەلوپەلی زۆر بەکاردێنێ، بەڵام پابەندە بە سەلامەتی نەخۆش، واتە نابێت لە ئەنجامی بەکارهێنانی ئەو ئامێرانە هیچ زیانێك بە نەخۆش بگات، ئەوەش لە بیرۆکەی سەرپەرشتی کردنەوە دروست بووە، کە چاودێری ئامێرو کەلوپەل بەرپرسە لەو زیانانەی لەو ئامێرانەوە بەر کەسانی تر دەکەوێت، دادوەریی لەسەر ئەوەیە پزیشك پابەندە بە پاراستنی سەلامەتی نەخۆش لەو زیانانەی لە پرۆسەی چارەسەر کردن‌و نەشتەرگەریدا لە ئەنجامی بەکارهێنانی ئەو ئامێرانە بەر نەخۆش دەکەوێت، چاودێری‌و پاسەوانی واتە بوونی هەژموون‌و دەسەڵات بەسەر شتێکدا لە بەکارهێنان‌و ئاراستە کردنیدا، ئەو زیانەی لێرەدا مەبەستە ئەو حاڵەتەیە لە ئەنجامی خراپی ئەو ئامێرانەوە دروست دەبێت، بۆیە دەبێت پزیشك ئامێرو کەلوپەلی ساغ بەکاربێنێ بۆ ئەوەی زیان بە نەخۆشەکەی نەگەیەنێت، ئەم پابەندبوونەش پابەندبوونە بە گەشتن بە ئەنجام‌و مەبەست، ئەگەرچی خراپی ئامێرەکە لە دروستکردنەکەیشیدا بێت، پزیشك کاتێك دەتوانێت بەرپرسیارێتی لەسەر خۆی لاببات، کە بیسەلمێنێت ئەو زیانە ڕویداوە بە هۆیەکی دەرەکیەوە بووە.[٢٥].

**چوارەم: لە دەرماندا:**

ئەگەر ئەو دەرمانەی نوسراوە زیانی بە نەخۆش گەیاند بەرپرسیارێتی پزیشك‌و دەرمانسازو کۆمپانیای دەرمانساز دەوروژێنێ، لەوانەیە لە بەرپرسیاریەتیدا هاوبەش بن، لە نوسینی هەموو ڕەچەتەیەکی دەرماندا پزیشك ملکەچی پرەنسیپی گشتی دەبێت کە پابەندبوونە بە ڕەنجدان‌و بەتەنگەوەهاتن، چونکە پزیشك پابەند ناکرێت بە چاکبونەوەی نەخۆش، پزیشك کاتێك بەرپرسیارێتی دەکەوێتە ئەستۆ کە نەخۆش بیسەلمێنێت پزیشك لە هەڵبژاردنی دەرمانی گونجاودا کەمتەرخەمی و درێخی کردووە.

یان له نووسینی ڕەچەتە و له چۆنیەتی بە کارهێنانی دەرماندا هەڵەی کردووە، بۆ نموونە پزیشك دەرمانێك دەنووسێت ژەهری تێدایە بە بێ ئەوەی چۆنیەتی و مەرجەکانی بەکارهێنانی دیاری بکات یان دەرمانەکە بە شێوەیەك دەنووسێت نەخوێنرێتەوە ئەوەش تێکەڵییەك بۆ دەرمانساز دروست دەکاتو دەرمانێکی دیکە بە نەخۆش دەدات کە دەبێتە هۆی مردنی نەخۆشەکە، بەڵام ئەو پرەنسیپەی حوکمی دەرمانساز دەکات پرەنسیپی پابەندبوونە بە ئەنجام گەیاندن نەك بە تەنگەوە هاتن، چونکە پابەندە بە کارێکی سنووردار وەك پێدانی دەرمانی دروست و شیاو بۆ بەکارهێنان. خۆ ئەگەر پابەند نەبێت و دەرمانی ماوە بەسەرچوو بفرۆشێتو، بە شێوەیەکی خراپ دەرمانەکەی عەمبار بکات کە پێچەوانەی ڕێنماییەکان بێتو زیان بە نەخۆش بگەیەنێت ئەوە دەرمانسازەکە بەرپرسە لەو زیانانەی بە نەخۆشەکە دەگات، بە هەمان شێوە دەرمانساز بەرپرسیار دەبێت لە هەر هەڵەیەك لە پێکهاتەی ئەو دەرمانانەدا ڕوو دەدات کە دەیگرێتەوە. [٢٦].

ئەگەر دەرمانساز پابەند نەبوو بەوەی پیشەکەی دەیسەپێنێت بە هەڵە دادەنرێت، هەڵەی دەرمانسازیش یان هەڵەی گرێبەستییە، یان هەڵەی درێخی کردنە، ئەگەر سەرپێچی لەو پابەندبوونەی گرێبەستەکەدا هاتووە بکرێت هەڵەی گرێبەستی لێدەکەوێتەوە، هەر کاتێکیش دەرمانساز سەرپێچی ئەرکە گشتییەکانی یاسای کرد کە وریابوون و زیان نەگەیاندنە بە خەڵك ئەوە هەڵەی درێخی کردن دروست دەبێت.

بڕیاری دادگای پێداچوونەوە لەسەر دەرمانساز قاسم الخالدی لە دانیشتنی ١٥\٥\١٩٥٤ دەڵێ : (ئەگەر نەسەلما دەرمانساز درێخی کردووە و، دەرکەوت لە پێدانی دەرمان بە نەخۆش وریای و خەمخۆری پێویستی بەکار هێناوە بەرپرسیارێتی ناکەوێتە ئەستۆ). ئەو فەقیهانەی لەم بابەتەدا توێژینەوەیان کردووە لەسەر ئەو بۆچوونەن پابەندبوونی دەرمانساز سنوورداره بە پێدانی دەرمانی دروست... ئەمەش مانای وایە پابەندبوونی دەرمانساز گەشتن بە ئەنجامە. [٢٧]. دادوەریی عێراقی لە هەڵەکردنێکی ئاسایی دەرمانسازدا بەرپرسیاریی خستوەتە ئەستۆی دەرمانساز، واتە هەرکات هەڵە ڕویدا بەرپرسیارێتی دروست دەبێت، بڕیاری دادگای پێداچونەوەی عێراقی ژمارە ٥٣/١٩٧٠ لە ١٩٧٠/١٢/٢٢ دەڵێ: ( دانپیانانی دەرمانساز بە ئامادەنەبونی بەبێ ئەوەی جێگرێکی دەرمانسازی مۆڵەتپێدراو لەجێی خۆی دابنێ بە هەڵە دادەنرێت، چونکە یاسا ڕێگا نادات

دەرمانسازێك ئامادە نەبێت، ئەگەر دەرمانسازێکی مۆڵەت پێدراوی نەخستبێتە جێی خۆی). [٢٨].

**ئەو هەڵە پیشەیانەی لەوانەیە دەرمانساز بیکات:**

**١ - مومارەسەکردنی پیشەی پزیشك:**

وەك دەستنیشان کردنی نەخۆشی و پێدانی دەرمان بەبێ گەڕانەوە بۆ پزیشکی پسپۆڕ، یاسا قەدەغەی کردوە دەرمانساز پێکەوە مومارەسەی پیشەی خۆی و پیشەی پزیشك بکات، بڕگەی شەشەمی ماددەی سێی یاسای مومارەسە کردنی پیشەی دەرمانسازی عێراقی دەڵێ: ﴿ نابێت -دەرمانساز پێکەوە- مومارەسەی پیشەی خۆی و پیشەی پزیشکیی، یان پزیشکی ددان، یان پزیشکی ڤێتێرنەری بکات﴾.

یاسای ژمارە (٨)ی ساڵی ١٩٩٩ی سەندیکای دەرمانسازەکانی هەرێمی کوردستان، لە ماددەی دەیەمدا دەڵێ: ﴿ دەرمانساز بۆی نییە پیشەکەی خۆی لەگەڵ پیشەی نوژداری و نوژداری ددان و نوژداری ئاژەڵی بە یەکەوە کۆبکاتەوە، ئەوەی دەرمانساز پێی هەڵدەستێت لە فریاکەوتنی سەرەتایی لە کاتی ڕوداوی لە ناکاو بە پەلە بە کارێکی ناڕەوای نوژداری ناژمێردرێ ﴾.

**٢ - گۆڕینی دەرمان و چارەسەر:**

لە ژیانی پراکتیکیدا بە هەر هۆیەکەوە بێت لەوانەیە دەرمانساز ئەو دەرمانەی پزیشك نوسیویەتی بگۆڕێت بە دەرمانێکی تر، بێگومان ئەوکارە مەترسی زۆری لێ دەکەوێتەوە، لەوانەیە پزیشك بە شێوەی شرینقە دەرمانی نوسیبێ، بەڵام دەرمانساز بە شێوەی حەب دەرمانەکە بدات بە نەخۆش، لەکاتێکدا لەوانەیە دەرمانەکە بە شێوەی شرینقە خێراتر کار بکات و، نەخۆشەکە لەمردن ڕزگاربکات، دەبێت ئەوە بزانرێت دەرمانساز مافی هیچ گۆڕانکاریەکی ڕەچەتەی پزیشکی نییە، بە لابردن، یان خستنەسەری هیچ دەرمانێك بەبێ ڕەزامەندیی پێشوەختی پزیشك، لە ماددەی (١٤)ی یاسای مومارەسە کردنی پیشەی دەرمانسازی عێراقیدا هاتووە: ( ئەگەر دەرمانساز دڵنیا نەبوو لەوەی ئەو دەرمانەی بە نەخۆشی داوە وەك ئەوەیە لە ڕەچەتەی پزیشکدا نوسراوە، ئەوە هەڵەیەکی گەورەی کردووە).

٣ – کاری دەرمانسازی بەبێ مۆڵەت:

بەپێی ماددەی (٣٠) یاسای سەندیکای دەرمانسازانی عێراقی: هەرکەس بە بێ مۆڵەت مومارەسەی پیشەی دەرمانسازی بکات، یان هەر ناوو ناوبانگێکی بە خۆی دابێت، بەرپرسیارێتی دەکەوێتە ئەستۆ، چونکە پابەندبوونی دەرمانساز جێبە جێبونی ئەنجامە، هەرکات کارەکەی نەگەشت بە ئەنجامو مەبەست کەوتوەتە هەڵەوە. [٢٩].

بڕگەی (١)ی ماددەی حەوتەمی یاسای ژمارە (٨)ی ساڵی ١٩٩٩ی سەندیکای دەرمانسازەکانی کوردستان دەڵێ: ﴿ بێجگە لە ئەندامانی سەندیکا ئەوانەی هەموو پابەندیەکی خۆیان بە گوێرەی ئەم یاسایە جێبەجێ کردووە نابێ دەست بدەنە پیشەی دەرمانسازی﴾.

پێنجەم: پێکهاتەو ئەندامی دەستکرد:

پێشکەوتنی زانستیو تەکنەلۆژی ئەو هەلەی ڕەخساندوە بۆ قەرەبوو کردنەوەو جێپڕکردنەوەی ئەو ئەندامە سروشتیانەی مرۆڤ لە دەستی دەداتو، تووشی کەمئەندامیو شێواوی ڕواڵەتی دەکات، پەنا بۆ ئەندامی دەستکرد ببرێت. [٣٠].

لێرەدا دەبێت جیاوازی بکەین لەنێوان کاری پزیشکیدا کە پابەندبوونە بە تەنگەوەهاتنو ڕەنجدانو، کاری هونەری کە پابەندبوون تیایدا بە ئەنجام گەیاندنە، کاری پزیشکی دەبێت گونجاو بێت بۆ ئەو ئەرکەی بۆی دروست کراوە، پزیشك بە بەرپرسیارو سەرپێچیکاری پابەندبوونەکەی دادەنرێت ئەگەر دروست کردنی ئەندامە دەستکردەکە خراپ بێت، یان ئەو ماددە لێی دروست کراوە خراپ بێت، یان جۆرو قەبارەکەی لەگەڵ لاشەی نەخۆشەکەدا نەگونجێت، یان فەرمانەکەی پێ جێبەجێ نەکرێت، یان زیان بە نەخۆشەکە بگەیەنێت، لە هەموو ئەوانەدا پزیشك بەرپرسیارە مەگەر بیسەلمێنێت ئەوانە بەهۆی دەرەکییەوە ڕویانداوە. [٣١].

پزیشکی ددانیش وەك هەموو پزیشکەکانی تر ملکەچی ئەو ڕێسایەیە کە تایبەتە بە ئەندامی دروستکراوو، پابەندە بە ئەنجام گەیاندن، بەلاّم لە چارەسەرکردندا وەك هەر پزیشکێکی تر داوای لێدەکرێت هەموو توانای خۆی بەکاربهێنێت، کاتێك بەرپرسیارێتی دەکەوێتە ئەستۆ کە بسەلمێنرێ لە کارەکەیدا درێخی کردوە. [٣٢].

پێکهاتەی ئەم ئامێرە ئەڵتەرناتیڤانە دوولایەن لەخۆ دەگرن، لایەنی پزیشکیو لایەنی هونەری، لایەنی پزیشکی لە مەودای کاریگەری ئەندامە دەستکردەکەو گونجانی لەگەڵ باری نەخۆشەکەو قەرەبووی کەموکورتیەکەیدا قەتیس دەبێت، لەم لایەنەدا واتە کاری پزیشکی پزیشك پابەندە ڕەنجی تەواو بداتو درێخی نەکات. بەڵام لایەنی هونەری سروشتی تەکنیکی هەیەو پەیوەندی بە شیاویو باشی ئەندامە دەستکردەکەوە هەیە، لەم لایەنەدا پابەندبوون سنوردارە کە پابەندبوونە بەئەنجام گەیاندنو گرەنتی شیاویو گونجاوی پێکهاتەکە لەگەڵ لاشەی نەخۆشەکەدا، ئەگەر ئەو پێکهاتە مەبەستەکەی جێبەجێ نەکرد، یان نەخۆشییەکی لێکەوتەوە پزیشك بەرپرسیار دەبێت، مەگەر بیسەلمێنێت بە هۆیەکی دەرەکی ڕوویداوە... یاساناسانو دادوەریی لە بارەی پزیشکی ددانەوە دەڵێن: کاری -پزیشکی ددان- لایەنی پزیشکیو هونەریشی تێدایە، لە هەردووکیاندا یەك ئەنجام هەیە کە سەلامەتی ددانەکەو گونجاویەتی بۆ دەمی نەخۆش، ئەگەر ددانەکە هەڵەیەکی تێدابوو، یان ئازاری بۆ نەخۆشەکە دروست کرد، یان وەزیفەی خۆی ئەنجام نەدا، بەرپرسیارێتی دەکەوێتە ئەستۆی پزیشك. دادوەریی بڕیاری ئەوەی داوە پابەندبوونی پزیشك بەئەنجام گەیاندنە. ئەوەی پەیوەندی بە کارکردنو پارێزگارییو گونجاوییو، بێ کەموکوڕیو، بەکارهاتنی بۆ مەبەستی دیاریکراو، دەکەوێتە ئەستۆی پزیشکی ددانو ددانساز. [٣٣]

**شەشەم: کوتان (ڤاکسین):**

ڤاکسین دەکرێت بە دوو بەشەوە، بەشێکیان تەوزیمی یەو، دەوڵەت لەڕێی تەندروستی گشتییەوە بڕیاری لەسەر دەدات، ئەم جۆرەیان هەر زیانێکی لێبکەوێتەوە بەرپرسیارێتی دەکەوێتە ئەستۆی دەوڵەت، بە چاوپۆشی لەوەی کێ دابەشی کردووە، پرۆسەی (ڤاکسین) کوتان دەبێت هیچ زیانێکی لێنەکەوێتەوە وەك تووشبوون بە نەخۆشییەکی گواستراوە، کوتان دەبێت ئەنجامی خۆی جێبەجێ بکاتو هیچ زیانێك بە کەسە کوتراوەکە نەگەیەنێت، بەڵام ئەگەر ڤاکسینەکە کاریگەری نەبوو ئەوا هیچ بەرپرسیارییەك دروست ناکات.

جۆری دووەم: تایبەتە، یان کەسێك داوای کوتان دەکات دژی نەخۆشییەك، ئەمە ڕێسای گشتی بەرپرسیارێتی دەیگرێتەوە، لەگەڵ پابەندبوونی بە ئەنجام گەیاندن دەکەوێتە

ئەستۆی ئەو پزیشك و كارمەندە ڤاكسینەكە دەدات، واتە نابێت لە ڕێی كوتانەكەوە زیان بە كەسە كوتراوەكە بگات. [٢٤].

**حەوتەم: سڕكردن:**

سنووری پابەند كردنی پزیشك بەستراوە بە ئاستی پیشەییەوە، ئەو بەرپرسیارییەی دەخرێتە ئەستۆی پزیشكێكی پسپۆڕەوە ناخرێتە ئەستۆی پزیشكێكی گشتی، پزیشكی بەنج پزیشكێكی گشتی نیە بەڵكو پزیشكێكی پسپۆڕە، بۆیە پابەندبوونی پزیشكی بەنج لە پابەندبوونی پزیشكی گشتی توندترە... لە هەمانكاتدا سنووری پابەندبوونی پزیشك بەستراوە بەو دۆخە دەرەكییەوە پزیشكەكەی تێدایە، وەك شوێنی چارەسەر كردن و توانای لە بەردەستابوو، هەبوونی ئامێری نوێ و پێشكەوتوو، پزیشكی بەنج هەمیشە لە نەخۆشخانەدایە... ئامێری تەواو و نوێی تێدایە... بۆیە كاری پزیشكی بێهۆشكەر لەسەر ئەنجامێكی سنووردار وەستاوە كە بەنج كردنی نەخۆش و بە ئاگا هێنانەوەیەتی بەبێ ئەوەی هیچ زیانێكی پێبگات. ئەم بەڵگانەی خوارەوە پاڵپشتی ئەوەن پابەندبوونی پزیشكی بەنج پابەندبوونی بە ئەنجام گەیاندنە:

١ – دەبێت پێش پرۆسەی بەنجكردن چەندین پشكنینی پزیشكیو هونەری ورد ئەنجام بدرێت، نابێت لە دەرەوەی نەشتەرگەری زیان بە نەخۆش بگەیەنرێ، لە كاتێكدا بەنجكردن پرۆسەیەكی یاریدەدەرەو، خۆی لە خۆیدا ئامانج نییە، هەر نەخۆشێك ڕودەكاتە نەخۆشخانە بۆ ئەوە ناچێت بەنج بكرێت، بەڵكو بۆ ئەوە دەچێت چارەسەر بكرێت، بەنجكردن یارمەتیدانی نەخۆشە بۆ بەرگەگرتنی ئازار، تا بتوانرێت بە ئاسانی نەشتەرگەری بۆ بكرێت.

٢ – لە پرۆسەی شرینقە لێداندا پێویستە هیچ زیانێك نەگەیەنرێت، ئەوەش پابەندبوون بە ئەنجامەوە دەگەیەنێت، لەبەر ئەوەی زۆربەی كاری پزیشكی بەنج بە پرۆسەی شرینقە لێدان دادەنرێت، بۆیە هەمان ڕێسای شرینقە لێدانی بەسەردا دەچەسپێنرێ، كە پابەندبوونە بە ئەنجامەوە، نەك ڕەنجدانو بەتەنگەوەهاتن. ئەركی پزیشكی بەنج ئەوەنییە شرینقەیەكی بەنج بدات لە نەخۆشو تەواو، بەڵكو دەبێت ڕەچاوی مەرجەكانی سەلامەتیو وریایی بكات، هەتا هیچ زیانێكی لاوەكی نەگات بە نەخۆش، سەرئەنجام كاری پزیشكی بەنج هاوشێوەی كاری ئەوانەیە خوێن بۆ نەخۆش دەگوێزنەوە، كە

ئەركیەتی خوێنێك بە نەخۆش بدات هەمان گروپ و هەمان جۆر بێت و، جووت و فیت بێت. ئەگینا نەخۆشەكە دەمرێت، كاری پزیشكی بەنج بێهۆشكردن نییە بە تەنیا، بەڵكو سڕكردن و بە ئاگاهێنانەوەشە.

٣ – پێشكەوتنی بواری پزیشكی و، بە تایبەت بەنج گریمانەكانی كەمكردوەتەوە، كاری پزیشكی بەنج وەك كوتان (ڤاكسین) وایە، كە پابەندبوونە بەئەنجام گەیاندن، بۆیە دەبێت نەخۆش بەئاگا بهێنرێتەوە و، لەو بەنجكردنەوە هیچ زیانێكی پێ نەگات.

٤ – بەكارهێنانی بەنج وادەخوازێت پزیشك وریایی وەربگرێت، ئایا نەخۆشەكە توانای وەرگرتنی بەنجی هەیە؟ چونكە ئەوانەی نەخۆشی دڵیان هەیە دەبێت بە وریاییەوە بەنجیان پێ بدرێت و، بزانرێت هێندەكەی چەندە و، لەوە دڵنیابێت خواردنی نەخواردوە، لە هەمانكاتدا نەخۆشەكە چ نەخۆشیەكی دیكەی هەیە، لەبەر ڕۆشنایی ئەو زانیاریانە چەندێتی و چۆنیەتی بەنجەكە دیاری بكات.

٥ – پابەندبوون بە سەلامەتی ئەوەنیە دەبێت نەخۆشەكە چاك ببێتەوە، بەڵكو ئەوەیە لە ڕێی ئەو شتانەی پزیشك بەكاری دێنێت زیانێكی تر نەگات بە نەخۆش.

٦ – پرۆسەی بەنجكردن پەیوەندی بە نەخۆشیەكەوە نییەو، دابڕاوە لە كاری چارەسەر كردن، بۆیە پابەندبوون پێوەی بەئەنجام گەیاندنە كە سەلامەتی نەخۆشەكەیە ... بۆیە پزیشكی بەنج دەبێت دڵنیابێت لە ئەنجامی كارەكەی ئەگینا ئەنجامی نەدات، تا نەخۆشەكە نەخاتە بەر مەترسیەك كە باری نەخۆشەكە نەیخوازێت، بۆیە هەر زیانێك بە نەخۆش بگات لەو بەنجەوە پزیشكی بەنج لێی بەرپرسیارە.[٣٥]

**هەشتەم: نەشتەرگەری پلاستیكی (جوانكاری):**

نەشتەرگەری پلاستیكی كۆمەڵە نەشتەرگەریەكن پەیوەندیان بە ڕواڵەتەوە هەیە، مەبەستەكەی چارەسەر كردنی ناتەواویە سروشتی یان دروستبووەكانە كە دەكەوێتە دەرەوەی لاشەی مرۆڤ و، كاریگەریان لەسەر بەهای كەسایەتی یان كۆمەڵایەتی تاك هەیە.[٣٦]. نەشتەرگەری پلاستیكی لە زۆربەی وڵاتەكاندا وەك هەموو نەشتەرگەریەكانی تر ملكەچی هەمان پرەنسیپی گشتی بەرپرسیارێتی پزیشكە كە پابەندبوونە بە هۆكارەوە، بەڵام دادوەریی لە سروشتی پابەندبوونی پزیشكیدا لە نەشتەرگەری

پلاستیکیدا لەبەر ئەم هۆیانە سەختگیری دەکات، لە گرنگترینیان هەموو نەشتەرگەریەکی جوانکاری بە مەبەستی چارەسەرکردن ئەنجام نادرێت، بەڵکو بە ئامانجی چاککردنی ناشرینییەکە کە لە خۆیدا هیچ مەترسییەکی بۆ سەر نەخۆش نییە و، هەرەشە لە تەندروستی کەسەکە ناکات، لە لایەکی دیکەوە ئەو نەشتەرگەریە بۆ جوانکاری ڕواڵەت یان باشکردنی باری دەروونییە و، ئەنجامدانی پێویستی بە پەلە کردن نییە. سەرەڕای ئەوەش ئامێری پێشکەوتوو هەیە بۆ ئەو کارە، لەبەر ئەمانە دادوەری پێداگری زۆر دەکات لە بەرپرسیارێتی پزیشك لە نەشتەرگەری جوانکاریدا. [٣٧].

لەم نەشتەرگەرییانەدا ئامانجی نەخۆش چارەسەرکردنی نەخۆشییەك نییە، بۆیە نەشتەرگەری جوانکاری پابەندبوونی بە ئەنجام گەیاندنی دەکەوێتە ئەستۆ، بەرپرسیارە لە سەرنەکەوتنی نەشتەرگەرییەکە، مەگەر بیسەلمێنێت ئەو سەرنەکەوتنە لەبەر هۆیەکی دەرەکی بووە. [٣٨].

بەشێك لە فەقیهەکان لەسەر ئەو بۆچوونەن پابەندبوونی نەشتەرگەر لە نەشتەرگەری جوانکاریدا پابەندبوونە بە ئەنجام گەیاندن، لەبەر ئەوە لە سەرنەکەوتنی نەشتەرگەرییەکەدا لێپرسینەوە لە پزیشك دەکرێت، بەتایبەت ئەگەر نەشتەرگەرییەکە بۆ پێویستییەکی چارەسەرکردن نەبێت. [٣٩].

بەشێك لە فیقهی شارستانی فەرەنسی گەشتنە ئەوە پابەندبوونی نەشتەرگەری ڕاستکردنەوە و جوانکاری پابەندبوونە بە ئەنجام گەیاندن، بە شێوەیەك لە سەرنەکەوتنی نەشتەرگەرییەکەدا لێپرسینەوە لە پزیشکی نەشتەرگەر دەکرێت، ئەوەی جۆری پابەندبوونی پزیشكو نەشتەرگەر لە کاری پزیشکی جوانکاریو چارەسەرکردندا دیاری دەکات، ئاستی پێشکەوتنی کاری پزیشکییە، پزیشکی جوانکاری ئەگەر نەگەشت بە ئەنجامو مەبەست ئەوا بەوە دادەنرێت پابەندییەکەی جێبەجێ نەکردووە. [٤٠].

# باسی دووەم

# بەرپرسیارێتی

## لقی یەکەم

## بەرپرسیارێتی تاوانکاریی پزیشك لە هەڵەی نابەنەنقەستدا( غیر عمدی )

**دەسپێك: بەرپرسیارێتی چی یە؟**

هەموو مرۆڤێك لە هەڵسوکەوتی ڕۆژانەیداو بە درێژایی ژیانی چەندین جۆر چالاکی ئەنجام دەدات، لەوانەیە لەو چالاکیانەدا زیان بە کەسانی تر بگەیەنێت، ئیتر ئەو زیانە ڕاستەوخۆ بێت، یان بە هۆی کارەکەیەوە بێت، یان لەو کەسانە بوەشێتەوە لە ژێر چاودێری ئەودان، یان لەو شتانە بکەوێتەوە کە لە ژێردەستی ئەودان. ئەگەر زیانەکە لە جێ بەجێ نەکردنی کارێك بکەوێتەوە کە یاسا سەپاندویەتی، ئەوە یاسا دێتە ناوەوەو سزای ئەوانە دەدات کە زیانیان بە کەسانی دیکە گەیاندوە، سزایش ئەوەیە کە پێی دەوترێ بەرپرسیارێتی، بەرپرسیارێتیش لە شێوازیاندا زۆرن‌و، لە سروشتیشیاندا جیاوازن، ئەو بەرپرسیاریەی یاسای سزادان بڕیاری لەسەر بدات، پێی دەوترێ **بەرپرسیارێتی تاوانکاریی**، بەڵام ئەو بەرپرسیاریانەی یاسای شارستانی یان یاساکانی تر بڕیاری لەسەر دەدەن پێیان دەوترێ **بەرپرسیایێتی شارستانی**.

بەرپرسیاریی شارستانیش دەکرێت بە دوو بەشەوە، لەوانەیە ئەو بەرپرسیارێتیە لە پێشێلکردنی پابەندبوونێك بێت کە لە گرێبەستێکەوە دروست بوبێت، ئەو کات پێی دەوترێ **بەرپرسیارێتی گرێبەستی**، یان لە سەرپێچی کردنی پابەندبونێك دروست بوبێت کە یاسا سەپاندویەتی، بەوکارەش دەوترێ: **بەرپرسیارێتی کاری ناڕەوا**، یان **بەرپرسیارێتی درێخی کردن**. جیاکردنەوەی ئەم جۆرە بەرپرسیاریانەش دەگەڕێتەوە بۆ یاساناسانی فەرەنسی.[٤١]

**١ – بەرپرسیارێتی لە زماندا:**

داوالێکراو، هەواڵلێپرسین، لێپێچینەوە، سەرزەنشتکراو.

**٢ – بەرپرسیارێتی لە زاراوەدا:**

پرۆفیسۆر مستەفا زەلمی دەڵێ: ﴿ بەرپرسیارێتی ئەوەیە، داوا لە کەسەکە دەکرێت ئەنجامی هەڵسوکەوتە نایاساییەکانی لە ئەستۆ بگرێت﴾.

محمد رەواس دەڵێ: ﴿ بەرپرسیارێتی واتە: پابەندکردنی کەسێك بە بژاردنی ئەو زیانەی لە هەڵسوکەوتیەوە بە کەسانی دیکەی دەگەیەنێ﴾. [٤٢].

**پێناسەی تاوان چی یە؟**

تاوان: دەستدرێژی کردنە سەر جەستەی مرۆڤە، بە جۆرێك پێویست بکات تۆڵە لە دەستدرێژیکەر بکرێتەوە، یان قەرەبووی پێ بکرێتەوە. [٤٣].

تاوان: هەموو رەفتارێکی دەرەکی ئەرێنی یان نەرێنی یە یاسا قەدەغەی کردوەو، ئەگەر مرۆڤێکی بەرپرس ئەنجامی بدات سزا دەدرێت [٤٤].

بەرپرسیاریی تاوانیی لەسەر پرەنسیپی یاسایبوونی تاوانو سزا ئەوەیە تەنیا یاسادانەر دەسەڵاتی دیاریکردنی ئەو رەفتارانەی هەیە کە سزای لەسەرەو پێی دەوترێ (تاوان)و، تۆڵەکەشی پێی دەوترێ (سزای) تاوانکاری. [٤٥].

لە برگەی دووەمی ماددەی (١٩)ی دەستوری عێراقی ساڵی ٢٠٠٥دا دەڵێ: ﴿ هیچ شتێك بە تاوان ناژمێرێو سزای لەسەر نییە بە دەقێکی یاسایی نەبێت، ئەو کردارە سزای لەسەرە لە کاتی کردنیدا یاسا بە تاوانی دانابێت ...﴾

لە ماددەی یەکی یاسای سزادانی عێراقی ژمارە (١١١)ی ساڵی ١٩٦٩ی هەموارکراودا هاتووە: ﴿ کردن یان نەکردنی کارێك سزای لەسەر نییە بە یاسایەك نەبێت لەکاتی ئەنجامدانیدا بە تاوانی دانابێتو، نابێت هیچ سزایەك بسەپێنرێ، یان رێکاری خۆپارێزی (إحترازي) بگیرێتەبەر بە دەقی یاسایی نەبێت﴾.

پزیشکیش وەك تاکەکانی دیکەی کۆمەڵکە ملکەچی لێپرسینەوەی یاسایی یە ... بەڵام ناکرێت پزیشکێك تۆمەتبارو دادگایی بکرێت ئەگەر هۆکانی تۆمەتەکە نەهاتنەدی، ئەم بەرپرسیاریەش لەسەر چەند پایەیەکی بنەڕەتی دروست دەبێت، لە هەڵەی پزیشکیەوە دەست پێدەکات، یەکەمیان وەك: درێخی کردنو کەمتەرخەمیو دەرچون لە ڕێساو بنەچە پزیشکیەکان کە زانست دانی پێداناوە. دووەمیان دروستبونی زیانە. سێیەم بوونی پەیوەندی هۆیەتیە لە نێوان هەڵەو زیاندا. [٤٦].

**ئەو هەڵە پزیشکیانەی بەرپرسیارێتی تاوانکاری نابەقەست دروست دەکەن:**

یاسادانەری عێراقی لە ماددەکانی ( ٣٥و ٤١١و ٤١٦)ی یاسای سزادانی عێراقی ژمارە (١١١)ی ساڵی ١٩٦٩ی هەموارکراودا چەند جۆرێك لە جۆرەکانی هەڵەی دیاری کردووە، کە ئەمانەی خوارەوەن: ( کەمتەرخەمی، هەڵەشەیی، بێئاگایی، خەمنەخواردنو، ڕەچاونەکردنی یاساو سیستەمو فەرمانەکان). دەتوانین بڵێین هەمویان شتێك دەگرنەوە، ئەویش **کەموکورتیو درێغی کردنە**، لە ماددەی (٣٥)ی یاسای سزادانی عێراقیدا دەڵێ: ﴿ تاوان بە ئەنقەست دانانرێت ئەگەر ئەنجامی ئەگەر ئەنجامی تاوانکاری بێتەدی بەهۆی هەڵەی بکەرەوە، ئیتر ئەو هەڵە لە کەمتەرخەمی، یان هەڵەشەیی، یان بێئاگایی، یان خەمنەخواردن، یان ڕەچاونەکردنی یاساو سیستەمو فەرمانەکان بوو﴾. ئەو تاوانە نابەقەستیانەی بەرپرسیارێتی پزیشکی لێ دەکەوێتەوە ئەمانەی خوارەوەن:

**یەکەم: کەمتەرخەمیو درێخی کردن (الاهمال والتقصیر):**

کەمتەرخەمی بێئاگابوونو پشتگوێ خستنی ئەو کارەیە کە پێویستە کەسی وریا ئەنجامی بدات، ئەمەش لە شێوەی ڕەفتاری نەرێنیدا دەردەکەوێت. [٤٧].

یان: کەمتەرخەمی ئەوەیە تاوانبار خۆی گێل بکات لە کردنی کارێك ئەرکی وریایی دەیخوازێت بیکات، تا ئەنجامێکی تاوانکاریی ڕونەدات. [٤٨]. کەمتەرخەمی هەڵوێستێکی نەرێنی یە، خۆی لە جێبەجێ نەکردنی ئەرکێکدا دەبینێتەوە کە دەبێت هەموو کەس لەو دۆخەدا ئەنجامی بدات. [٤٩].

نموونەی کەمتەرخەمی:

_ وەستاندنی ئۆتۆمبێل لە شوێنێکدا ببێتە هۆی ڕوداوی پیاکێشان.

_ هەڵکەندنی چاڵێك لە سەر ڕێگایەکداو، دانەنانی هێمایەك، تا ڕێبواران خۆیانی لێ بپارێزن. [٥٠].

بەڵام کەمتەخەمی لە بواری پزیشکیدا کاتێك دێتەدی پزیشك بایەخی پێویست بە کارەکەی نەدات، بەوەش ئەنجامێکی نایاسایی لێ بکەوێتەوە، هەڵەی کەمتەرخەمی هەڵوێستگرتنی نەرێنیە، وەك وازهێنان، یان نەکردن. لە نموونەی:

١ – کەمتەرخەمی کردن لە پشکنینی تەواو پێش دەستێومردانی پزیشکیی.

٢ – بەجێ هێشتنی پارچە شاشێك لە برینی نەخۆشدا، لە کاتی نەشتەرگەریدا.

کاکڵەی هەڵەکردن لە کەمتەرخەمیدا، هەڵسوکەوتێکی خۆویستە، ئەنجامێکی زیانبەخشی لێ دەکەوێتەوە، بگەر پێشبینی کارەکەی دەکرد، یان دەبوایە پێشبینی بکردایە، – نەمەبەستی بوو ڕوبداتو، نە پەسەندیشی بوو– ئەگەر پزیشکەکە وریا بوایە ئەوە ڕوی نەئەدا. [٥١].

دووەم: هەڵەشەیی ( الرعونە):

هەڵەشەیی واتە: نەبوونی لێهاتنو، کەمیی ڕاهاتنو، خراپیی مەزەندە کردن. [٥٢].

مەبەست لە هەڵەشەیی نەبوونی دەرککردنو شارەزایی کاروباری هونەریو پیشەییو، نەبوونی هاوسەنگیە لە کاردا. [٥٣].

هەڵەشەیی خراپ مەزەندەکردنی ئەنجامی کارە، یان نەبوونی سەلیقەیە، یان نەزانینو لێنەهاتنە. هەڵەشەیی ڕەفتارێکی ئەرێنییە، تاوانبار کارێك ئەنجام دەدات بە مەترسی تەنراوە، بەلاّم کەسەکە ئەو مەترسیە مەزەندە ناکاتو، دەرك بەو ئەنجامە ناکات کە پێی یاسا سزای لەسەرە، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ خراپ مەزەندە کردنو لێنەهاتنو، نەزانین.

**نموونەی هەڵەشەیی:**

- نەشتەرگەریکردن لە کاتێکدا ئامێرەکان پاکژ نەکرابنەوەو، لە ئەنجامی ژەهراوییبووندا نەخۆشەکە بمرێت.
- نووسینی دەرمانێك بەهەڵە ببێتە هۆی مردنی نەخۆشەکە.
- پەرستارێك بەبێ ڕاوێژکردن بە پزیشك لە ڕێی دەمارەوە شرینقەیەك بدات لە نەخۆشێك‌و. زیانی پێ بگات.

**سێیەم: وریانەبوون‌و پارێزنەکردن (عدم الحيطة والحذر):**

ئەوە ئاشکرایە هەموو تاکێکی کۆمەڵگە دەبێت لە هەڵسوکەوتیدا وریا بێت‌و خۆی بپارێزێت تا ئەو مافانە نەخاتە مەترسیەوە کە یاسا دەیانپارێزێ، بۆیە دەبێت هەموو تاکێك پێشبینی ڕەفتارەکانی خۆی بکات، بۆ ئەوەی پارێزراو بێت‌و، لەو ڕەفتارەیەوە ئەنجامی نایاسایی نەکەوێتەوە.

ئەگەر تاوانکار چاوەڕوان بێت کردارەکەی ئەو ئەنجامە زیانبەخشەی لێ بکەوێتەوەو، هەوڵ نەدات ئەو ئەنجامە دروست نەبێت، ئەوە پارێزنەکردنی ئەنجام داوە، دەشتوانین بڵێین خۆنەپارێزی چالاکیەکی ئەرێنییە، کە بنەچەکانی ئەرکەکانی وریایی‌و خۆپارێزی پێشێل دەکات، لەم شێوە هەڵەکردنەدا تاوانکار سروشت‌و پێکهاتەی ڕەفتارەکانی‌و، ئەو زیانەش بە یاسای دەگەیەنێت دەزانێت، لەگەڵ ئەوەشدا تا کۆتایی لەسەر ئەو ڕەفتارە بەردەوام دەبێت، ئەوەش مانای هەڵەی چاوەڕوان کراو لە خۆ دەگرێت، جیاوازی خۆنەپارێزی‌و کەمتەرخەمی ئەوەیە، کەمتەرخەمی چالاکیەکی نەرێنیەو، -هەڵەکە ئەوەیە- کەسەکە ئەرکەکەی خۆی جێبەجێ ناکات، بەڵام وریانەبوون چالاکیەکی ئەرێنی یەو، کەسەکە ئەرکێکی یاسایی پێشێل دەکات.[٥٤] لەم شێوەدا بکەر سروشتی کارەکەی دەزانێت‌و، ئەوەش دەزانێت لەوانەیە ئەو ڕەفتارەی ئەنجامی خراپی لێ بکەوێتەوە، بەڵام پێشبینی ئەوەی نەدەکرد، چونکە توانا‌و لێهاتنی خۆی نەخستبویە گەڕ.[٥٥]

مەبەست لە خۆنەپاراستن‌و وریانەبوون ئەوەیە پزیشك مەترسی ئەو کارە دەزانێت کە دەیکات‌و، پێشبینی ئەو ئەنجامە ترسناکەش دەکات کە لەوانەیە لێی بکەوێتەوە، بەڵام بەپێی پێویست خۆی ناپارێزێت، تا لە کۆتاییدا ئەو ئەنجامەی لێ دەکەوێتەوە.[٥٦]

**نموونەی وریانەبوون و پاریز وەرنەگرتن:**

**١ - بەکارهێنانی تیشك لە چارەسەرکردندا، بەڵام ئامێرە بەکارهاتووەکان کوالیتی و، تایبەتمەندی پێویستیان نەبێت.**

**٢ - دەرکردنی نەخۆش لە نەخۆشخانە پێش تەواوکردنی ماوەی تەواوی چارەسەر کردنی.**

**٣ - بەکارهێنانی شرینقەی (پەنسلین) بەبێ تێست کردن، تابزانرێت نەخۆشەکە هەستیارە بە پەنسلین، یاخود هەستیار نییە.**

**چوارەم: سەرپێچی کردنی یاساو لائیحەکان ( مخالفة القانون واللوائح):**

ئەم جۆرە هەڵەیە پەیوەستە بە خودی هەڵەکە خۆیەوە، چونکە هەرکات یاساو ڕێنمایی و فەرمانەکان پێشێل کران و، بە هۆی ئەو سەرپێچی یەوە شتێك ڕویدا، بەرپرسیارێتی دەکەوێتە ئەستۆی بکەرەوە (پزیشك). [٥٧]

ئەم هەڵەیە کاتێك دێتەدی کە تاوانبار سەرپێچی ئەو ڕێسایانە بکات کە هێزی پابەندبوونی یاساییان هەیە، وەك یاساو ڕێنماییەکان، هەرکات بەهۆی ئەو سەرپێچی کردنەوە ئەنجامێکی زیانبەخش ڕویدا بەرپرسیارێتی لێ دەکەوێتەوە، هەرچەند سەرپێچیکار هیچ جۆرێکی دیکەی هەڵەی نەکردبێت، بەم جۆرە هەڵەیە دەڵێن (هەڵەی تایبەت)، تا لە هەڵەکانی دیکە جیا بکرێتەوە،

**ئەم جۆرە هەڵەیە دوو شت لەخۆ دەگرێت:**

**أ - سەرپێچیکردنی یاساو ڕێنمایەکانە، ئەوەش لە خۆیدا تاوان دروست دەکات.**

**ب - بە هۆی ئەو سەرپێچییەوە ئەنجامێکی زیانبەخش دروست ببێت، بە جۆرێك ئەگەر ئەو سەرپێچییە نەبوایە. تەسەوری ئەو زیانە نەدەکرا. [٥٨]**

مەبەست لە ڕەچاو نەکردنی یاساو سیستەمەکان ئەوەیە ڕەفتاری تاوانبار بە باری ئەرێنی. یان نەرێنیدا پێچەوانەی ڕێسا فەرمیەکان بێت کە لە میریەوە دەرچوبێت ئیتر ئەو فەرمانانە یاسا، یان سیستەم. یان ڕێنمایی، یان بڕیاری کارگێڕی بن. ئەگەر ڕە... ی

بکەر جووتی ئەو ڕێسایانە نەبوو کە بەپێی یاساو ڕێساکان دەبێت بگیرێتە بەر، ئەو ڕەفتارە هەڵە پێکدێنێ.[٥٩]

**سزای ئەنجامدانی ئەو هەڵانەی سەرەوە:**

هەر جۆرێك لەو هەڵانە ئەنجام بدرێت‌و، زیانی لێ بکەوێتەوە ئەم سزایانەی لێ دەکەوێتەوە،

**لە ماددەی (٤١٦)ی یاسای سزادانی عێراقیدا دەڵێ:**

**﴿١ - هەرکەس بە هەڵە ئازارێك، یان نەخۆشیەکی بۆ کەسێکی تر دروست کردو، ئەو ئازارو نەخۆشیەش لە کەمتەرخەمی، یان هەڵەشەیی، یان بێئاگایی، یان خەمنەخواردن، یان ڕەچاونەکردنی یاساو سیستەم‌و فەرمانەکان کەوتەوە، سزا دەدرێت بە بەندکردن بۆ ماوەیەك لە شەش مانگ زیاتر نەبێت‌و، غەرامە دەکرێت بە بڕێك لە (٢٢٥٠٠٠) دینار زیاتر نەبێت، یان سزا دەدرێت بە یەکێك لەو دوو سزایە.**

**٢ - سزاکە بەندکردن دەبێت بۆ ماوەیەك لە دووساڵ زیاتر نەبێت، ئەگەر لە تاوانەکەوە کەمئەندامی هەمیشەیی دروست بوو، یان لە ئەنجامی ئەوە بووە تاوانکار پێشێلێکی گەورەی بنەمای وەزیفەکەی، یان پیشەکەی یان ئیشەکەی کردووە، یان لە کاتی ئەو هەڵەکردنەی کە ئەو ڕوداوەی لێ کەوتووەتەوە لە ژێر کاریگەری ماددەی سەرخۆشکەر یان هۆشبەردا بوو.﴾.**

**بەپێی ماددەی (٤١١)ی یاسای سزادانی عێراقی، ئەگەر بە هۆی ئەو هەڵانەوە کەسێك کوژرا، بەند دەکرێت بۆ ماوەی کەمتر لە ساڵێك‌و، غەرامەکردنی بە بڕێك لە (٢٢٥٠٠٠) دینار زیاتر نەبێت. خۆ ئەگەر لەو هەڵەوە سێ کەس یان زیاتر کوژران، بەند دەکرێت بۆ ماوەیەك لە سێ ساڵ کەمتر نەبێت**

**بەرپرسیارێتی کارگێڕیی کەمتەرخەمی کردن لە ڕاپەڕاندنی ئەرکەکاندا:**

دادگای پێداچونەوەی فیدراڵی لە بڕیاری ژمارە ٣٧/م١/ ٢٠٠٤ لە ١٨/ ٥/ ٢٠٠٤، فەرمانی ئەو قەرەبوکردنەوەی پەسەند کرد کە لە دادگای تێهەڵچونەوەی بابلەوە دەرچوبوو، ناوەڕۆکی بڕیارەکە قەرەبوکردنەوەی داواکار بوو بۆ لایەنی ئەدەبی‌و، ئەو

هەڵەی لە دەستی چوبوو، ئەو زیانەی لێی کەتبوو، کە لە ئەنجامی ئەو کەمتەرخەمیو، درێخی کردنەی پەیڕەوکار بوو بە هۆی مردنی دوو منداڵی داواکار، دادگای کەتنی کەربەلا، بڕیارەکەش بەندکردنی کەسەکەی سەر بە فەرمانگەی هەردوو داوالەسەر کراوان بەپێی ماددەی (٣٤١)ی یاسای سزادانی عێراقی. (٦٠)

بڕیاری دادگای پێداچونەوەی فیدراڵی ژمارە ٣٧/م/٢٠٠٤/١ لە ١٨/ ٥/ ٢٠٠٤ لەم بڕیاری پێداچونەوەدا ڕوون دەبێتەوە دادگای پێداچونەوە بەرپرسیارێتی کارگێڕی لە کاری پزیشکیدا بەپێی حوکمەکانی بەرپرسیارێتی پەیڕەوکراو لە کارەکانی پەیڕەوکار بنیات ناوە، کە لە یاسای شارستانی عێراقیدا لە بڕگەی (١)ی ماددەی (٢١٩) هاتووە: ﴿ میریو شارەوانیەکانو، دەزگاکانی تر کە کاری خزمەتگوزاری گشتی پێشکەش دەکەن ... بەرپرسیارن لەو زیانەی فەرمانبەرەکانیان دروستی دەکەن، ئەگەر زیانەکە لە ئەنجامی زیادەڕۆییەك دروست بووە لە کاتی جێبەجێ کردنی ئەرکەکەیدا﴾. لەم کەیسەدا ڕوون دبێتەوە کەمتەرخەمیو درێخی کردنەکە لە کاتێکدا ڕویداوە کارمەندەکە لە نەخۆشخانەدا کاری کردوە. چونکە مەرجی پابەند کردنی پەیڕەولێکراو بە قەرەبوو کردنەوەی ئەو زیانەی پەیڕەوکار دروستی کردووە دەبێت زیانەکە لە زیادەڕۆیی پەیڕەوکارو لە کاتی پێشکەش کردنی خزمەتگوزاریدا دروست بوبێت.

لە بڕیارێکی دادگای پێداچوونەوەدا لە ١٧/ ٢/ ٢٠٠٢، دادگا پاڵپشت بە ڕاپۆرتی لیژنەی پسپۆڕ لە وەزارەتی تەندروستی کە بوونی کەمتەرخەمیو درێخی کردنی سەلماندبوو، دادگا گەشتە ئەوە لە کارەکەدا هەڵەکردن هەبووە. (٦١)

لە ماددەی (٨٩)ی پرۆژەی دەستوری هەرێمی کوردستان – عێراق، دەڵێ: ﴿ هەرکەس لە ئاکامی ڕەفتارێکی هەڵە، یان گوێ پێنەدانی کارمەندانی فەرمانگەو دەستە حکومیەکانی هەرێمی کوردستان لە کاتی ئەنجامدانی کارەکانیاندا زیانێکی پێگەیشتبێ. بۆی هەیە داوای قەرەبوو کردنەوە لەو لایەنانە بکات.

لە ڕودانی هەرتاوانێکدا نابەقەست بێت، یان بە ئەنقەست بێت تاوانبار ئەنجامی بداتو، ئەو ئاسەوارانەی لێ بکەوێتەوە کە یاساکان باسیان کردوە تاوانبار سێ جۆر سزا دەیگرێتەوە، یەکەمیان سزای تەمێ کردنە کە دورخستنەوەیە (فصل) بۆ ماوەی بەندکردنو زیندانی کردنەکەی بەپێی ماددەی (٧/ب)ی یاسای ژمارە (١٤)ی ساڵی

١٩٩١ی هەوارکراوی بەرزەفتکردنی فەرمانبەرانی دەوڵەت‌وو کەرتی گشتی. دووەمیان سزای شارستانی یە، زیان لێکەوتوو لە بەردەم دادگایەکی شارستانیدا داوای قەرەبوکردنەوە دەکات. سێیەمیان سزای تاوانکاری بەپێی یاسای سزادانی عێراقی هەرتاوانە چەندە بەندکردن یان زیندانی کردن، یان بڕیاری ماوەی دورخستنەوەی بۆ دیاری کراوە.

## لقی دووەم

## بەرپرسیارێتی تاوانکاری پزیشک لە هەڵەی بە ئەنقەستدا : ( عمدی )

پزیشک لەبەر ئەوەی مرۆڤە لەوانەیە تاوان ئەنجام بدات، ئیتر ئەو تاوانە تاوانی ئاسایی بن یان پەیوەندیان بەکاری پزیشکیەوە هەیە، وەك لەباربردنی کۆرپەلەو ئاشکراکردنی نهێنی نەخۆش‌و نوسینی ڕاپۆرتی ساختە، چونکە ئەو تاوانانە بە هەمووکەس ناکرێت، ئەگەر لە ڕێی پیشەوە نەبێت، واتە پیشەکە فاکتەری ئاسانکاری ئەو تاوانانەیە، ئەمانەی خوارەوە ئەو تاوانە ئەنقەستانەیە لەوانەیە پزیشکی تێوە بگلێت:

**یەکەم: لەباربردنی کۆرپەلە ( الاجهاض):**

﴿ لەباربردن بریتیە لە کۆتایی هێنانی بە ئەنقەستی سکپڕی پێش وادەی سروشتی خۆی﴾. [٦٢]

لە پێناسەکەی سەرەوە ڕوون دەبێتەوە بە کۆتایی هاتنی سکپڕی پێش وادەی سروشتی خۆی لەباربردن دێتەدی، ئیتر بە دەرهێنانی کۆرپەلە بێت لە منداڵدانی دایکیدا پێش وادەی بە سروشتی لەدایکبون، ئەگەرچی بە ڕەزامەندی ژنەکەش دەرهێنرابێت، یان لە منداڵدانی دایکیدا کوژرا بێت، بێگومان وەك چۆن کوشتنی کۆرپەلە لەناو منداڵداندا دەبێتە هۆی هاتنە دەرەوەی، چونکە مانەوەی کۆرپەلە بە مردویی لە سکی دایکیدا دەبێتە هەڕەشە لەسەر تەندروستی‌و ژیانی دایکەکە، بە هەمان شێوە دەرهێنانی کۆرپەلە بە زیندویی پێش وادەی لەدایکبونی سروشتی بە زۆری پاش ماوەیەك دەمرێت. [٦٣]

یاسادانەر وەك چۆن ڕاستەوخۆ سەلامەتی جەستەی مرۆڤ لە ڕێی بە تاوان ناسینی هەر ئازارێك پێی دەگات دەپارێزێ، لە هەمانکاتدا بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆش لە ڕێی بە تاوان دانانی لەباربردن دەیپارێزێ.

**جۆرەکانی لەباربردن:**

**ا – لەبارچونی سروشتی:**

ئەو لەبارچونەیە هۆیەکی دیاریکراوی نییەو، هیچ دەستێوەردانی تێدا نەکراوەو، بەبێ ویستی ژنەکە ڕویداوە ... لە ١٥-٢٠٪ی سکپڕی بە لەبارچونی سروشتی کۆتاییان دێت.[٦٤]

**لەباربردنی چارەسەرکردن:**

چۆڵکردنی منداڵدانە لە ڕێی دەستێوەردانی نەشتەرگەری لە لایەن پزیشکێکی پسپۆڕ بۆ ڕزگارکردنی ژیانی سکپڕەکە، چونکە ئەگەر سکپڕیەکە بەردەوام بێت مەترسی لەسەر ژیانی هەیە ... دەبێت ئەم لەباربردنە لەو شوێنانەدا ئەنجامبدرێت کە وەزارەتی تەندروستی سەرپەرشتی دەکات [٦٥].

**ج – لەباربردنی تاوانکاری:**

لەباربردنی تاوانکاری پرۆسەی چۆڵکردنی مناڵدانی سکپڕە بەبێ ئەوەی هۆیەکی پزیشکی هەبێت، لەوانەیە سکپڕەکە خۆی ئەنجامی بدات، یان کەسێکی دیکە بە ڕەزامەندی سکپڕەکە یان بە بێ ڕەزامەندی سکپڕەکە ئەنجامی بدات. [٦٦].

**سزای لەباربردن لە یاسای سزادانی عێراقیدا:**

لەباربردن لەبەر پێویستی نەبێت تاوانەو، یاسا سزای بۆ داناوە، چونکە سەرەڕای توندو تیژیەکەی دەستدرێژی کردنە سەر گەشەکردنی کۆمەڵگەشە، یاسادانەری عێراقی لە ماددەکانی (٤١٧، ٤١٨، ٤١٩)ی یاسای سزاداندا لەباربردنی قەدەغەکردوە. (٦٧).

**د – سزای لەباربردن بە ڕەزامەندی کەسەکە:**

بڕگەی (١)ی ماددەی (٤١٧)ی یاسای سزادانی عێراقی دەڵێ: ﴿ هەر ژنێك بە هەر هۆیەك سکەکەی لەباربرد، یان بە ڕەزامەندی خۆی ڕێگای دا کەسێکی دیکە سکەکەی لەبار ببات، سزا دەدرێت بە بەندکردن بۆ ماوەیەك لە ساڵێك زیاتر نەبێتو، غەرامە دەکرێت بە بڕێك لە (٢٢٥٠٠٠) دینار زیاتر نەبێت، یان سزا دەدرێت بە یەکێك لەو دوو سزایە ﴾.

بڕگەی (٢)ی ماددەکە دەڵێ: ﴿ هەرکەس بە ئەنقەستو بە ڕەزامەندی ژنێك سکەکەی لەبار برد، سزا دەدرێت بە هەمان سزای سەرەوە، ئەگەر لەباربردنەکە، یان ئەو ئامڕازەی تیایدا بەکارهاتووە بوو بە هۆی مردنی تاوان لەسەرکراو (ژنە سك پڕەکە)، ئەگەرچی لەباربردنیش ڕوینەدابێت سزاکەی بەندکردن دەبێت بۆ ماوەیەك لە حەوت ساڵ زیاتر نەبێت﴾.

لە بڕگەی (٣)ی ماددەکەدا هاتووە: ﴿ بە باری گرانکار (ظرف مشدد) دەژمێرێ بۆ تاوانکار ئەگەر پزیشك، یان دەرمانساز، یان کیمیاوی، یان مامان، یان یاریدەرێکی ئەوان بێت﴾.

**هـ – سزای لەباربردن بە بێ ڕەزامەندی ژنەکە:**

لە بڕگەی (١)ی ماددەی (٤١٨)ی سزادانی عێراقیدا دەڵێ: ﴿ هەرکەس بە ئەنقەستو، بە بێ ڕەزامەندی ژنێك سکەکەی لەباربرد، سزا دەدرێت بە زیندانی کردن بۆ ماوەیەك لە دە ساڵ زیاتر نەبێ﴾.

بڕگەی (٢)ی هەمان ماددە دەڵێ: ﴿ ئەگەر لەباربردنەکە، یان ئەو ئامرازەی بەکارهاتووە لە ڕودانیدا بوو بە هۆی مردنی تاوانلێکراو، ئەگەر لەباربردنیش ڕونەدات، سزاکەی زیندانی کردن دەبێت بۆ ماوەیەك لە پانزە ساڵ زیاتر نەبێت﴾.

بڕگەی (٣)ی هەمان ماددە دەڵێ: ﴿ بە باری گرانکار دادەنرێت ئەگەر تاوانکار پزیشك، یان دەرمانساز، یان کیمیایی، یان مامان، یان یاریدەدەرێکیان بێت، لەسەر دادگایە فەرمان بدات بە قەدەغەکردنی لە مومارەسە کردنی پیشەکەی بۆ ماوەیەك لە سێ ساڵ زیاتر نەبێت﴾.

لە هەردوو ماددەکەدا بڕگەی سێیەم مەبەستی باسەکەی ئێمەیە، دەبینین ئەگەرچی لەباربردن بەبێ هۆی پزیشکی بۆ هەموو کەس تاوانەو سزای لەسەرە، بە ڕەزامەندی یان بە بێ ڕەزامەندی سکپڕەکە بێت، بەڵام بۆ پیشە پزیشکیەکان سزاکەی توندتر کراوەتەوەو، بە باری گرانکار دانراوە، چونکە بۆ ئەنجامدانی لەباربردن زۆرتر پەنایان بۆ دەبرێت، بۆیە یاسادانەر سزای توندتری بۆ داناون. خودی یاساکە داوا دەکات تەمێ بکرێت بە سێ ساڵ دورخستنەوە لە کارەکەی، سەرەڕای زیندانی کردنی، لەگەڵ سزای

شارستانی به قەرەبوکردنەوەی زیان لێکەوتوو، بەپێی برگەی (ب)ی ماددەی (٧) یاسای ژمارە (١٤)ی ساڵی ١٩٩١ی هەموارکراوی بەرزەفتکردنی فەرمانبەرانی دەوڵەتو کەرتی گشتی، ماوەی زیندانی کردنەکەی لە وەزیفەکەی دوردەخرێتەوە.

**دووەم: کوشتنی سۆزو بەزەیی: ( القتل الرحيم)**

کوشتنی بەزەیی (ئەتانازیا) لە وشەی (Euthanasia)ی گریکی وەرگیراوە، (Eu) بە مانای باشو ئاسانو بەزەیی، (Tathanas) بە مانای کوشتنو مردن دێت. هەردو وشەکە بەسەریەکەوە واتە: مردنی بە بەزەیی. (فرانسوا باکۆن)ی پزیشك لە کتێبەکەی بە ناوی (چارەسەری ئەو نەخۆشیانەی لە چاکبونەوەی بێهیوا بوون) لە سەدەی حەڤدەدا یەکەم کەس بوو ئەم وشەیە بەکار هێنا.(٦٨)

**١ - کوشتنی بەزەیی چییە؟**

بریتیە لە پەلەکردن لە ڕودانی مردنی ئەو نەخۆشانەی بە دەست ئازاری نەخۆشیەکی کوشندەوە دەناڵێننو، هیوای چاکبونەوەیان نییە.(٦٩)

دەرکەوتنی ئەم زاراوە (کوشتنی بەزەیی) لە سەدەی بیستەمدا لێدوانێکی زۆری لە نێوان پزیشکانو بیرمەندانو یاساناسانو شەرع زاناندا دروست کرد لەسەر ڕەوابوونو ناڕەوابوونیدا، لەکاتێکدا هیوای چاکبونەوە لە نەخۆش نەکرێتو، بە دەست ئازارەوە بناڵێنێ، ئایا دروستە پەنای بۆ ببرێت؟ ئەگەرچی چەند وڵاتێکی کەمی ڕۆژاوا وەك هۆڵندا ئەم کوشتنە بە تاوان نازمێرێ، بەڵام زۆرینەی وڵاتان دژایەتی کوشتنی بەبەزەیی دەکەنو، ئەم جۆرە کوشتنە بە کوشتنی ڕاستەقینە دادەنێن، کە هەموو پایەکانی کوشتنی بە ئەنقەستی تێدایە، ئیتر بە هەر مەبەستێکەوە ئەنجام بدرێت گرنگ نییە، ئامانجی بنەڕەتی پزیشك نەخۆشەو نابێت خۆی لێ ببوێرێ، لە هەمانکاتدا بە بەردەوامی زانست لە پێشکەوتندایەو، لەوانەیە ئەو نەخۆشیەی ئەمڕۆ چارەسەری نییە سبەی چارەسەری بدۆزرێتەوە.(٧٠)

ڕێنمایەکانی ڕەفتاری پیشەیی کە ئەنجومەنی سەندیکای پزیشکانی عێراقی بە بڕیاری ژمارە (٦) لە ١٩/٥/ ١٩٨٥دا بڵاوی کردەوە، دەڵێ: ﴿ ڕوداوەکانی نەخۆشیە سەختەکان کە هیوای چاکبونەوەیان نییەو، ئازارێکی بەردەوامیان هەیەو، نەخۆشەکەو کەسوکاری

پێوەی دەناڵێنن، -نەخۆش- پەنا دەبات بۆ پزیشك كۆتایی بەو ڕەوشە بێنێت‌و، لەم ژیانە ڕزگاری بكات، كوشتنی نەخۆشەكە لەم بارەدا بە كوشتن دادەنرێت، ئەگەرچی بە ڕەزامەندی نەخۆشیش بێت﴾.

بەم پێیە لە یاسای عێراقیدا كوشتنی بەزەیی سزای كوشتنی ئەنقەستی هەیە، كە لە ماددەی (٤٠٥)ی یاسای سزادانی عێراقیدا هاتووە سزاكەی زیندانی هەمیشەیی یان كاتیە. یان بەپێی بڕگەی (١)ی ماددەی (٤٠٨)ی یاسای سزادانی عێراقی گونجاندنی بۆ دەكرێت كە یارمەتیدانی خۆكوژی یە، ئەویش زیندانی كردنە بۆ ماوەیەك لە حەوت ساڵ زیاتر نەبێت. لێرەدا بە ڕوونی دیارە لە یاسای عێراقیدا كوشتنی بەزەیی تاوانەو، هیچ بیانویەك نیە بۆ پزیشك پەنا بۆ ئەم جۆرە كوشتنە ببات، ئەگەر پزیشك ئەنجامی بدات بەرپرسیارێتی بۆ دروست دەبێت‌و، سزای لێ دەكەوێتەوە.

## ٢ – بەكارهێنانی ئامێری بوژانەوەی دەستكردو بەر پرسیاری تاوانی پزیشك:

لەم ساڵانەی دواییدا شێوازێكی نوێی چارەسەر كردن لە بواری پزیشكیدا دەركەوت كە ساڵانی پێشتر نەبوو، یارمەتی ئەو نەخۆشانە دەدات كە ڕووبەڕوی مەرگ دەبنەوە، دەتوانێت سوڕی خوێن چالاك بكاتەوەو، لێدانی دڵ‌و هەناسە وەرگرتن‌و هەناسە دانەوە بگەڕێنێتەوە. زۆرجار ئەم چارەسەرە سەركەوتو بووە لەوەی نەخۆشەكەی بە ئاگاهێناوەتەوەو، زیندە چالاكیەكانی بۆ گەڕاندوەتەوە ... ئەم شێوازەش ناودەبرێت بە بوژاندنەوەی دەستكرد یان چاودێری ورد. كاتێك نەخۆش دەكەوێتە دۆخێكی مەترسیدارەوە وەك: ڕوداوە پرمەترسیەكان‌و، ژەهراویبون بە مادەی هۆشبەرو خەوهێنەرو، پەككەوتنی گورچیلەو، تێكچونی لێدانی دڵ‌و، نەشتەرگەری كراوەی دڵ‌و، لەكاركەوتنی كاتیی یان لاوەكی مێشك پزیشكەكان ئامێری بوژانەوە بە كار دەهێنن، چونكە لە زۆربەی ئەو ڕەوشانەدا نەخۆش دەبورێتەوەو بێهۆش دەبێت‌و، بە شێوەیەكی كاتیی مێشك دەوەستێت، یان دڵ‌و سیەكان بە سروشتی دەوەستن، یان بە هۆی مردنی قەدی مێشكەوە بۆ هەمیشەیی لەكار دەكەوێت، ئەگەر بشتوانرێت بە هۆی بوژاندنەوەی دەستكردەوە سوڕی خوێن‌و لێدانی دڵ بەردەوام بێت. لەم بارەدا لەسەر بەكارهێنانی ئامێری بوژاندنەوەی دەستكرد كێشمەكێشی گەورە دروست دەبێت، ئەویش زانینی مەودای بەرپرسیاری تاوانی پزیشكە لە بەكارهێنانی ئامێری بوژاندنەوەی دەستكرد

لەبەر تیشکی دیاریکردنی ساتی مردن، چونکە بەپێی پێوەری مردنی (مێشک) ئەو کەسەی دەچێتە باری بێهۆشی هەمیشەییەوە بە مردوو دادەنرێت. [٧١]

**٣ - پێوەرەکانی مردن:**

**ا - مردنی ڕواڵەتی:**

مەبەست لە مردنی ڕواڵەتی وەستانی زیندە چالاکیەکانی جەستەی مرۆڤە کە پشتی بە لێدانی دڵو هەناسەدان بەستووە، بەگوێرەی ئەم پێوەرە بە دڵنیابونی پزیشک لە کارکەوتنی دڵو سیەکان مردن دروست دەبێت. [٧٢]

**ب - مردنی خانەیی:**

مردنی خانەیی واتە مردنی خانەو شانەکانی ئەندامەکانی جەستە، کە دوای وەستانو لەکارکەوتنی تەواوی کۆئەندامەکانی لاشە دەستپێدەکات، ئەویش لە ئەنجامی وەستانی تەواوی پرۆسەی میتابۆلیزمەوەیە.

**ج - مردنی مێشک:**

مردنی مێشک لەکارکەوتنی مێشکە بە وەستانی هەناسەدان بە شێوەیەکی سروشتی، بە مردنی قەدی مێشک (Brain stem) کە سەنتەری هەناسەدانو سوڕی خوێن لەوێدایە مردن ڕودەدات. [٧٣]

زۆربەی زانایانی پزیشکیو شەرعی پشتگیری پێوەری مردنی مێشک دەکەن، ئەمانەی خوارەوەش بەڵگەن لەسەر قسەکەمان:

- کۆنگرەی نێودەوڵەتی تایبەت بە گواستنەوەو چاندنی ئەندامەکان لە مەدرید لە ساڵی ١٩٦٦ دەڵێ: ( وەستانی کۆتایی کاری مێشک پێوەری دیاریکردنی ساتی مردنە).
- کۆنگرەی کۆلیژە پزیشکیەکانی شانشین لە بەریتانیا لە ساڵی ١٩٧٦ هەمان بۆچونیان هەیە.
- کۆمەڵەی پزیشکی نێودەوڵەتی لە ساڵی ١٩٦٨ لە سیدنی گەشتنە هەمان ئەنجام.

- یەکەم کۆنگرەی کەنداو بۆ سڕکردن و چاودێری ورد لە ساڵی ١٩٩١ گەشتنە هەمان شت.
- کۆنگرەی ساڵانەی تۆڕی مردوو لە سان فرانسیسکۆ لە ساڵی ١٩٩٦ مردنی قەدی مێشکی بە مردنی گشتی دانا.
- ئەنجومەنی فیقهی ئیسلامی لە کۆنگرەی سێیەمی خۆیدا لە عەمانی پایتەختی ئوردون لە ساڵی ١٩٨٦ هەمان ڕاو بۆچونی هەبوو.
- ڕێکخراوی ئیسلامی بۆ زانستی پزیشکی لە کوەیت لە ساڵی ١٩٨٥ هەمان ڕای هەبوو. (٧٤).
- لە یاسای عێراقیدا لە ماددەی دووەمی یاسای گواستنەوەو چاندنی ئەندامەکان ژمارە (٨٥)ی ساڵی ١٩٦٨ دەڵێ: ( مردن بە دینایەت بە مردنی قەدی مێشک نەبێت). ماناکەی وایە بە مردنی قەدی مێشک مردن دێتەدی.

**٤ - بەکارهێنانی ئامێری بوژانەوەی دەستکرد بۆ نەخۆشێ لە سەرەمەرگدایەو بەرپرسیاری تاوانی پزیشک:**

رودەدات نەخۆشێك ببرێتە لای پزیشك لە بارێكی مەترسیداردا بێتو پێویست بە دەستێوەردانی خێرای پزیشك بكاتو، بۆ ڕزگار كردنی لە مردن ئامێری بوژانەوەی دەستكردی بۆ دابنێ، لەم بارەدا پزیشك پابەندە بە هەوڵدانی تەواو بۆ چارەسەر كردنی نەخۆشەكەی، دەبێت بەخێرایی ئامێرەكەی بۆ دابنرێ، یان ڕەوانەی ئەو شوێنە بكرێت كە ئامێرەكەو پزیشكی پسپۆڕی لێ یە، تا ئەو كاتەی بارودۆخی باش دەبێتو پێویستی پێی نامێنێت، یان مردنی ڕاستەقینەی بۆ پزیشكەكە دەسەلمێت. ئەگەر پزیشك ئەو پابەندبونەی خۆی جێبەجێ كرد لێپپرسینەوەی لێ ناكرێت هەرچەند ئەنجامەكەی هەرشتێك بێت، چونكە پزیشك پابەندە بە هەوڵدانی تەواو، نەك بە چاكبونەوە. (٧٥).

پزیشك مافی ئەوەی نییە بە ناوی بێ هیوا بوون لە چارەسەركردنو ساغبونەوەی نەخۆش ئامێری بوژانەوەی دەستكردی بۆ دانەنێت، ئەو ڕەفتارە نەرێنیە بەرپرسیارێتی تاوانی بۆ پزیشك دروست دەكات، یان تاوانی یارمەتی نەدانی نەخۆش پێكدێنێ، یان تاوانی كوشتنی بە ئەنقەست لە ڕێی نەرێنی یەوە. لە هەمان

کاتدا لەوانەیە دەستنیشان کردنی نەخۆشیەکە هەڵەبێتو، نەخۆشەکە نەخۆشیەکی کوشندەی نەبێت.

ئەگەر دەستنیشان کردنەکەش دروست بێت، نابێت پزیشك بێ هیوا بێتو، دەبێت چی بۆ دەکرێت درێغی نەکات.

ئەگەر بەزەیی بە نەخۆشەکەدا دێتەوە، کوشتنی بەزەیی تاوانەو، سزای لەسەرە.

ئەگەر کارەکەش نەکاتو، ( إمتناع) بکات، ئەویش تاوانە. بۆیە ناکرێت پزیشك نەچێت بەدەمی نەخۆشەکەیەوە. ماددەی (٣٣٠) یاسای سزادانی عێراقی دەڵێ: ﴿هەر فەرمانبەرێك یان راسپێراو بە ڕاژەی گشتی بە ناڕەوا کارێك لە کارەکانی وەزیفەکەی ئەنجام نەدا، سزا دەدرێت بە بەندکردن ... ﴾. ماددەی (٣٣١)یش بە هەمان شێوە سزای داناوە بە بەندکردن، یان غەرامە، یان هەردوکیان.

**٥ – لێکردنەوەی ئامێری بوژانەوەی دەستکرد لە نەخۆش:**

بۆ ئەوەی لەبەر لێکردنەوەی ئامێری بوژانەوەی دەستکرد بەرپرسیارێتی تاوانی نەکەوێتە ئەستۆی پزیشك، دەبێت پێش لێکردنەوە ئەم دوو مەرجە بێنەدی:

مەرجی یەکەم: دڵنیابوون لە مردنی نەخۆش بەپێی پێوەری مردن، (لە یاسای عێراقیدا بە مردنی قەدی مێشك مرۆڤ بە مردو دادەنرێت)، پێش لێکردنەوەی ئامێرەکە، دەبێت لیژنەیەکی پزیشکی دادوەری کە لە سێ پزیشكو یاساییەك پێکهاتبێ مردنەکە دوپات بکەنەوە.

مەرجی دووەم: هەرچەند پزیشك دڵنیاش بێت لە مردنی نەخۆشەکە، بۆی نییە ئامێری بوژانەوەکە لاببات، هەتا ئەوکاتەی لە لایەن لیژنە پێکهاتووەکەوە مردنەکە ڕادەگەیەنرێ، ئەگەر لیژنەکە یاسایی تێدا نەبوو دەبێت لەوبارەوە ئاگاداری داواکاری گشتی بکرێت.[٧٦]

**یێەم: تاوانی ئاسانکاریو بەکارهێنانو نوسینی دەرمانی هۆشبەر:**

ۆشبەرو ئالودەبوون بە دەردێکی کۆمەڵایەتی مەترسیدار دادەنرێت، بەو ئاسەوارە راپو ڕوخێنەرە تەندروستیو، ئابوریو، ئاسایشیەی هەیەتی، بەکارهێنانی هەڕەشەیە

بۆ کەسەکەو هەموو کۆمەڵگە، لەم دیدەوە یاسادانەرانی هەموو وڵاتەکانی جیهان مکوڕن لەسەر دژایەتی کردنی ئەم دەردە مەترسیدارە، لەو بارەشەوە بۆ قەڵاچۆکردنی بە هەموو ڕێگایەك‌و، بۆ پاراستنی تاکەکانی کۆمەڵگە لەو دەردە یاسای گونجاوو، سزای سەختیان داناوە بۆ ئەوانەی بە هەر جۆرێك بەکاری دەبەن‌و، بۆ ئەوانەش بە ڕێی خراپ بەکاری دێنن. لەبەر ئەوەی هەندێك جۆری هۆشبەر لە چەند حاڵەتێکدا لە بواری پزیشکیدا بەکار دێن، بۆیە ڕێگا بە پزیشکان دراوە ئەو دەرمانەی پێکهاتەکەی ماددەی هۆشبەری تێدایە بنوسن بۆ ئەو نەخۆشانەی پێویستیانە، ئەگەر پزیشك ئەمەی خراپ بەکار هێنا ئەوە کارێکی مەترسیداری کردوەو، لەوانەیە توشی بەرپرسیارێتی تاوانی ببێتەوە. (٧٧).

ماددە هۆشبەرەکان کۆمەڵێك ماددەی ڕووەکیی یان دەستکردن، ئالودەبوون پێیانەوە کەسەکە ناچار دەکات بە ناچاریی بە بەردەوامی بەکاری بهێنێت، لە ڕێکەوتنە نێو دەوڵەتیەکان‌و، یاسا ناوخۆیەکاندا دیاری‌و یاساغ کراون، وەك: (الإتفاقية الوحيدة للمخدرات لسنة ١٩٦١، بصيغتها المعدلة ببروتوكول سنة ١٩٧٢، في مؤتمر الأمم المتحدة لسنة ١٩٧٢). ( لیژنەی قەڵاچۆکردنی ماددە هۆشبەرەکان بۆ ساڵی ١٩٩٥ کۆبونەوەکانی خولی سی‌وهەشتەمینی لە نەمسا گرێداو، باسی ئەو ڕێگا چارانەی کرد کە هاریکاری نێو دەوڵەتی لە بواری قەڵاچۆکردنی خراپ بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان دەستەبەر دەکات...). ﴿ یاسای ژمارە ٦٨ی ساڵی ١٩٦٥ی ماددە هۆشبەرەکان، کە بە یاسای ژمارە ١٤٤ی ١٩٧٩ هەموار کراوەو، یاسای هەموارکردنی سێیەمی ژمارە ٣٨ لە بەرواری ٢٠٠٢/٩/٧، ماددەی هۆشبەرو، جۆرەکانی‌و، سزاکانی بەکارهێنان‌و بازرگانی پێوەکردنی دیاری کردوەو، دەڵێ: ماددەی هۆشبەر هەموو ئەو ماددە سروشتی‌و دروستکراوانەن کە لە خشتەی هاوپێچی یاساکەدا هاتوون. - خشتەی یەکەم (٨٠) ماددەو، خشتەی دووەم (٨) ماددەو، خشتەی سێیەم (٥) ماددەو، خشتەی چوارەم (٤) ماددە لە خۆ دەگرێت - سزاکەی دەگاتە زیندانی هەتاهەتایی لەگەڵ کاری قورس، یان ئیعدام کردن﴾. وەزارەتی تەندروستی هەرێمی کوردستانیش بە بەیانی ژمارە (٧١)ی ساڵی ٢٠١٢ کە لە ژمارە (١٤٧) وەقایعی کوردستان لە بەرواری ٢٠١٢/٧/١ بڵاو کراوەتەوە، ئەم ماددانەی زیاد کردوە بۆ خشتەکانی یاساکە. -واتە بە ماددەی هۆشبەر دایناون- ماددە زیاد کراوەکانیش ئەمانەن: ﴿ ١- ئەمفیتامین، ٢- ترامادۆڵ، ٣-

سۆمادریل، ٤- تارتان، ٥- ڤالیۆم، ٦- شروبی باڵمۆ کە کۆداینی تێدایە، ٧- شروبی توسیرام کە کۆداینی تێدایە﴾.[٧٨]

برگەی (١)ی ماددەی (٨)ی یاسای هۆشبەرەکان دەڵێ: ﴿ هەموو ئەوانەی لە ماددەی سێیەمدا هاتوون _واتە هەموو ماددە هۆشبەرەکان- نابێت لە ژێردەستی هیچ کەسێکدا هەبن بێجگە لە پزیشکەو، پزیشکی ددانو، پزیشکی ڤێتەرنەریو، دەرمانسازو، ئامادەکاری تۆمارکراوو مۆڵەتپێدراو بە مومارەسە کردنی پیشەکەیانو، کۆگای دەرمانو، کارگەی دەرمانی مۆڵەتدراوو، دەزگا تەندروستیە میریەکانو، دەزگاو پەیمانگاو ئەو کەسانە بۆ ئەم مەبەستە مۆڵەتدراون، یان کەسێك لە ڕێی دەرمانسازێکی مۆڵەتپێدراو بەدەستی هێنابێت لە پزیشکێکەوە بە پێی ڕەچەتەی تۆمارکراو بەگوێرەی یاسای مومارەسە کردنی پیشەی دەرمانسازیو بازرگانی کردن بە دەرمانو ماددە ژەهرەکانەوە﴾. واتە یاساغە هۆشبەر لای هیچ کەسێك هەبێت تەنیا ئەوانە نەبێت مۆڵەتپێدراون.

برگەی (٢)ی ماددەی (٩) دەبێژێ: ﴿ پزیشکی مۆڵەتپێدراوو تۆمارکراو دەبێت تۆمارێکی هەبێت بۆ ڕەچەتەی هۆشبەرەکانو، کلێشەی تۆمارەکەش بە ڕێنمایی وەزارەت دیاری بکرێتو، بۆ ئەو مەبەستەش لەهەر کاتێکدا دەکرێت بپشکنرێت﴾.

برگەی (١)ی ماددەی (١٠) دەڵێ: ﴿ قەدەغە کراوە لە دەرمانسازان ئەو ڕەچەتانەی کۆکاین یان شیلەکەی تێدایە ئامادە بکەن بۆ بەکارهێنان لە دەرمانی چاودا، یان بۆ بەکارهێنانی دەرەکی، ئەگەر هێندی کۆکاین یان شیلەکەی لە ڕەچەتەکەدا باسکراوە لە /٣٠/ سانتیگرام زیاتر بێت، یان ئەگەر ڕێژەی کۆکاین یان شیلەکەی لە سەدا چوار زیاتر بێت، ئەگەر گیراوەکە بۆ بەکارهێنانی ناوەکی بوو دەبێت کۆکاین یان شیلەکەی تێکەڵی کەمتر لە دوو ماددەی پزیشکی نەکرێت، بە مەرجێك بڕی کۆکاینەکە لە گیراوەکەدا لە /٣٠/ سانتیگرام تێپەڕنەکات﴾.

برگەی (٢)ی ماددەکە دەڵێ: ﴿ بەپێی یاسای مومارەسەکردنی پیشەی دەرمانسازیو بازرگانی کردن بە مادە ژەهریەکانەوە، نابێت بە ڕەچەتەیەك هۆشبەری تێدا نوسراوە بۆ دووەم جار دەرمانی بۆ ئامادە بکرێت، بەڵکو دەبێت بە ڕەچەتەیەکی نوێی پزیشکی پێی بدرێت﴾.

بڕگەی (٣) دەڵێ: ﴿ ئەو ڕەچەتە پزیشکیانەی هۆشبەریان تێدا نوسراوەو دەرمانساز ئامادەی کردوە، دەبێت بە لای کەمەوە بۆ ماوەی سێ ساڵ بپارێزرێ‌و، لەو ماوەشدا دەکرێ بپشکنرێ﴾.

بڕگەی (٥)ی ماددەی چواردەی یاسای مومارەسە کردنی پیشەی دەرمانسازی دەڵێ: ﴿ئەو دەرمانەی ماددەی هۆشبەری تێدا بێت نابێت دەرمانساز سەرفی بکات، بەپێی حوکمی یاسا هەموار کراوەکانی هۆشبەرەکان نەبێت‌و، بە ڕەچەتەی تایبەت نەبێت، کە شێوازەکەی لە لایەن وەزیرەوە بە ڕێنمایی دیاری دەکرێت﴾. [٧٩]

## سزای سەرپێچی کردن:

لەسەرەوە ئەرکی پزیشك‌و دەرمانساز بەرامبەر هۆشبەرەکان دیاری کران، بەپێی یاسای هۆشبەرەکان سەرپێچیکار بەرپرسیارێتی تاوانی بۆ دروست دەبێت‌و، سزا دەدرێت.

ماددەی (١٤):

یەکەم –أ– ﴿ سەرپێچیکاری حوکمەکانی ماددەکانی یەکێك لە ماددەکانی نۆیەم‌و دەیەمی ئەم یاسایە سزا دەدرێت بە غەرامە کردن بە بڕێك لە دووسەد دینار زیاتر نەبێت، یان بەند دەکرێت بۆ ماوەیەك لە ساڵێك زیاتر نەبێت، یان بە هەردوکیان سزا دەدرێت﴾.

خاڵی (٢)ی بڕگەی –د– ﴿ سزاکە ئیعدامکردن دەبێت، یان کاری قورسی هەمیشەیی‌و، غەرامە کردن بە بڕێك لە دە هەزار دینار زیاتر نەبێت‌و، لە سێ هەزار دینار کەمتر نەبێت.

١ – .........................

٢ – ئەگەر تۆمەتبار فەرمانبەر یان کارمەندی گومرگ بێت، یان فەرمانبەرو کارمەندی گشتی بن‌و، ئەرکی قەڵاچۆکردن‌و چاودێری کردنی بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکانیان پێ سپێرابێت، یان ئەو فەرمانبەرو کارمەندە گشتی یانەبن بەهەر شێوەیەك لە شێوەکان کۆنتاکیان لەگەڵ ئەم ماددانەدا هەیە﴾.

بە کورتی: ماددەی هۆشبەر مەترسیدارەو، نابێت لای هیچ کەس هەبێت، تەنیا ئەوانە نەبێت لە یاساکەدا دیاری کراون، دەبێت ئەوانیش بەپێی یاسا مامەڵەی لەتەکدا بکەن،

چونكه سەرپێچی كردنی یاساكە بەرپرسیاری تاوانی بۆ پزیشكو دەرمانساز دروست دەكاتو، لەوانەیە ڕوبەڕوی سزا ببنەوە.

**چوارەم: تاوانكاری لە گواستنەوەی ئەندامەكانی لاشەدا:**

لەو كاتەوە بیرۆكەی گواستنەوەو چاندنی ئەندامەكانی مرۆڤ دەركەوتووە، ڕێكخراوو دەستە پزیشكیە نێودەوڵەتیەكان ئەو بڕیارو ڕاگەیاندنانە بڵاودەكەنەوە پرەنسیپەكانی ڕێنوێنی لەخۆ دەگرێت، بۆ ڕێكخستنی ڕێكارە پیشەییە پەیوەنددارەكان بەم بابەتەوەو، ڕاسپاردە كردنی بەردەوام بۆ كۆنترۆڵكردنی ئەو ڕەفتارانەی پرەنسیپەكان پێشێل دەكەن. ڕێكخراوی تەندروستی جیهانی لە چەندین بۆنەدا بازرگانی كردنی بە ئەندامی مرۆڤەوە پرۆتستۆ كردووە. وەك بڕیاری ١٣،٤٠ لە ساڵی ١٩٨٧و، بڕیاری ٥،٤٢ لە ساڵی ١٩٨٩و، بڕیاری ژمارە ٢٥،٤٤ لە ساڵی ١٩٩١ كە ڕەشنوسی پرەنسیپەكانی ڕێكخراوی تەندروستی جیهانی لەخۆ دەگرێت لە بارەی چاندنی خانەو شانەو ئەندامەكانی مرۆڤ، لەو پرەنسیپانەدا داوای قەدەغە كردنی كڕینو فرۆشتنی ئەندامەكانی مرۆڤ دەكات بۆ مەبەستی چاندن. (٨٠)

گرنگی ئەم بابەتە – گواستنەوەی ئەندامەكانی مرۆڤ – لەو بایەخ پێدانە گەورەوە دەردەكەوێت كە لە ئاستی هەرێمیو نێودەوڵەتیدا پێی دەدرێت، كۆمەڵەی چاندنی ئەندامەكانی مرۆڤ ساڵی ١٩٧٠ لە (لاهای) بۆ لێكۆڵینەوە لە گرفتەكانی بابەتەكە كۆنگرەی سێیەمی گرێدا.

لە عێراقیش بۆ یەكەمجار یاسای ژمارە (١١٢)ی ساڵی ١٩٧٠ی بانكی چاو دەرچوو، پاشان یاسای ژمارە (٦٠)ی ساڵی ١٩٨١ی نەشتەرگەری چاندنی گورچیلە دەرچوو. یاسای ژمارە (٨٥)ی ساڵی ١٩٨٦ی نەشتەرگەری چاندنی ئەندامەكانی مرۆڤ جێی گرتەوە ... لە شوباتی ساڵی ١٩٨٩ لە بەغدا كۆنگرەی پزیشكی عەرەبی بیستوپێنجەم لە بارەی چاندنی ئەندامەكانو، پێكراوەكانی جەنگ گرێ درا. (٨١)

یاسای چاندنی ئەندامەكانی مرۆڤ بەم شێوەی خوارەوە باسی ڕێپێدانو بەرپرسیارێتی چاندنی ئەندامەكان دەكات:

ماددەی یەکەم: بۆ مەبەستی بەدیهاتنی بەرژەوەندی چارەسەرکردن‌و بۆ پاراستنی ژیانی نەخۆش دروستە نەشتەرگەری چاندنی ئەندامەکانی بۆ بکرێت، پزیشکێکی نەشتەرگەری پسپۆڕو، لە سەنتەرێکی پزیشکی بە فەرمی ڕێپێدراودا ئەنجامی بدات، بە مەرجێك ئەو سەنتەرە بۆ ئەنجامدانی نەشتەرگەری چاندنی ئەندامەکانی مرۆڤ ئامادە کرابێت.

ماددی دووەم: لەم ڕێگایانەوە ئەندام بەدەستدەهێنرێ بۆ چاندن:

أ – هەرکەس بیبەخشێ، یان لە ژیانیدا وەسیەتی کردبێت، بە مەرجێك لە کاتی بەخشین، یان وەسیەت کردنەکەیدا شیاو بێت‌و بە نوسراو بێت.

ب – ئەوەی بە پێی بەڵگە زانستیە تازەکان توشی مردنی مێشك بووە، لە کاتێکدا خزمێکی پلە یەکی یان پلە دووی شیاوی ڕەزامەندبێت، لەگەڵ ڕەزامەندی لیژنەیەك لە سێ پزیشکی پسپۆڕ پێکهاتبێت، یەکێکیان پسپۆڕی نەخۆشیەکانی مێشك‌و دەمار بێت‌و، پزیشکی چارەسەرکارو ئەوەی نەشتەرگەریەکە ئەنجام دەدات لە لیژنەکەدا نەبن.

ماددەی سێیەم: بە هەموو شێوەیەك کڕین‌و فرۆشتنی ئەندامەکان یاساغەو، هەرکات پزیشك بەوەی زانی قەدەغەیە نەشتەرگەریەکە ئەنجام بدات.

کەواتە یاسای عێراقی ڕێگای داوە بە چاندنی ئەندامەکان بەم مەرجانە:

- پزیشکی پسپۆڕ ئەنجامی بدات.
- لە سەنتەرێکدا ئەنجام بدرێت بە فەرمی ڕێپێدراو بێت‌و، بۆ ئەو مەبەستە ئامادەکراو بێت.
- ئەندامەکە بەخشرابێت، یان وەسیەت کرابێت لە لایەن کەسێکی شیاوەوە. یان ئەندامی کەسێك بێت، توشی مردنی مێشك بوبێت، بە ڕەزامەندی کەسێکی پلە یەك یان پلە دووی‌و، بە ڕەزامەندی لیژنەیەکی پزیشکی پسپۆڕ.
- ئەندامەکە کڕین‌و فرۆشتنی پێوە نەکرابێت.

هەر پزیشکێك ئەندامی مرۆڤی چاندو ڕەچاوی ئەو خاڵانەی نەکرد، توشی لێپرسینەوەی تاوانی دەبێتەوەو بەپێی ماددەی چوارەمی ئەم یاسایە سزا دەدرێت، کە ئەمە دەقەکەیەتی: هەرکەس سەرپێچی حوکمەکانی ئەم یاسایە بکات سزا دەدرێت بە

بەندکردن بۆ ماوەیەك لە ساڵێك زیاتر نەبێت‌و، غەرامە دەکرێت بە بڕێك لە هەزار دینار زیاتر نەبێت، یان سزا دەدرێت بە یەکێك لەو سزایانە. [٨٢]

**پێنجەم: تاوانی نوسینی ڕاپۆرتی ساختە (مزور):**

ڕاپۆرتی پزیشکی لە هەموو کارگێڕی‌و وەزارەتێکدا بە پاڵپشتێکی گرنگی سەلماندن دەژمێرێت، ئیتر چ لە بواری دادوەریدا بێت، یان لە بواری دڵنیایی دەستەبەر کردنی کۆمەڵایەتیدا بێت، ڕاپۆرتی پزیشکی ئەگەر مەرجەکانی تێدا بێت، ماف‌و ئەرکی لێدەکەوێتەوە. [٨٣] کۆمەڵگە هاوچەرخەکان لە زۆربەی کاروباری ژیانیاندا پشت بە نوسراوە فەرمی‌و عورفی یەکان دەبەستن، ئەم پشت پێبەستنەش لەسەر متمانە کردنە بەو نوسراوانە، متمانەی ئەوەی ئەو نوسراوانە ڕاستیەکی دیاریکراویان لە خۆ گرتووە، دەستکاری کردنی ئەو ڕاستیەش وا دەکات ئەو نوسراوانە وەزیفەی کۆمەڵایەتی‌و یاسایی لە دەست بدەن، وەزیفەی کۆمەڵایەتی دروستکردنی متمانەیە بۆ تاکەکان کە مافەکانیان لە بەڵگەنامەکەدا نوسراوەو پارێزراوە، وەزیفەی یاساییش لەوەدا بەرجەستە دەبێت ئەو نوسراوانە لە دادوەریدا بۆ یەکلایی کردنەوەی کێشەکان پشتی پێدەبەسرێت.

**١ - ساختەکردن (تەزویر) چی یە؟**

یاسای سزادانی عێراقی لە ماددەی (٢٨٦)دا بەم شێوە پێناسەی تەزویری کردوە: ﴿ساختە کردن گۆڕینی ڕاستیەکانە بە ڕێگایەکی ماددی‌و مەعنەوی بە مەبەستی فێڵکردن لە پاڵپشتێکدا، یان دیکۆمێنتێکدا، یان هەر نوسراوێکدا کە یاسا دیاری دەکات، گۆڕینێك کاری ئەوەبێت زیان بە بەرژەوەندی گشتی، یان بەرژەوەندی کەسێك بگەیەنێت﴾. [٨٤]

**٢ - ڕێگاکانی ساختەکردن:**

ماددەی (٢٨٧)ی یاسای سزادانی عێراقی ڕێگاکانی شێوازەکانی ساختەکردنی ماددی‌و مەعنەوی دیاری کردوە، ڕێگا مادیەکان پێنج شێوازن‌و، ڕێگا مەعنەویەکانیش چوار شێوازن، یەکێك لەو شێوازانە تایبەتە بە ڕاپۆرتی پزیشکی ساختە، لە برگەی (ب)ی خاڵی (٢)ی ماددەی سەرەوەدا دەڵێ: ساختەکردنی مەعنەوی ئەوەیە: ڕوداوێکی ساختە بکرێت بە ڕوداوێکی دروست، لەگەڵ ئەوەش بزانرێ ساختەو دروستکراوە.

### ٣ – نوسراوی فەرمی چی یە؟

ماددەی (٢٨٨)ی یاسای سزادانی عێراقی بەم شێوازە پێناسەی دەکات: ﴿ نوسراوی فەرمی ئەو نوسراوەیە فەرمانبەرێك، یان پێسپێراوێك بە خزمەتگوزاری گشتی تۆماری دەکات، وەك ئەوەی یاسا دایناوەو، لە سنوری دەستەڵاتی ئەودا بێت، یان بە هەر شێوەیەك بووە دەستی وەرداوەتە نوسینەکەی، یان مۆرکی فەرمی پێ بەخشیوە﴾.

### ٤ – راپۆرتی پزیشکی چی یە؟

﴿ راپۆرتی پزیشکی بریتی یە لە تۆمارێکی (معاینە) جێ بینی پزیشك بە درێژی نوسراوە، لەسەر داوای لایەنێکی تایبەتمەند پزیشك ئامادەی دەکات، پێناسەی خۆیو لایەنی داواکارو، حاڵەتە پشکنراوەکەو، شوێنی بینینەکەو، کورتەیەك لە بارودۆخی ڕوداوەکەی تێدا دەناسێنێ﴾.[٨٥]

### ٥ – شێوازی ڕاپۆرتی پزیشکی:

یاسا شێوازێکی تایبەتی دانەناوە بۆ ڕاپۆرتی پزیشکی، بەڵام دەبێت ئەم خاڵانە لە خۆ بگرێت:

- ناوی پزیشك: ناونیشانی زانستی، ئەدرەسەکەی، ئەو دەزگایە ڕاپۆرتەکەی لێ نوسراوە.
- ناوی کەسە بینراوەکە: تەمەنی، بۆ کێ نوسراوە، کەسەکە بە تەواوی بناسێنرێ.
- رونکردنەوەی مەبەست لە نوسینی ئەو ڕاپۆرتە چی یە.
- واژۆی پزیشكو بەرواری نوسینەکە.

### ٦ – سزای نوسینی ڕاپۆرتی ساختە:

ماددەی ( ٢٨٩)ی یاسای سزادانی عێراقی دەبێژێ: ﴿ بێجگە لەو حاڵەتانەی یاسا حوکمێکی تایبەتی بۆ داناوە، هەرکەس لە نوسراوێکی فەرمیدا ساختەی کرد، سزا دەدرێت بە زیندانی کردن بۆ ماوەیەك لە پانزە ساڵ زیاتر نەبێت﴾.

**لە ماددەی (٢٥٥)دا دەڵێ: سزا دەدرێت بە سزای شایەتیدانی درۆ:**

**١ – هەرکەس لە دادگایەك یان لەو لایەنانەی لە ماددەی (٢٥١)دا ( دادگایەکی شارستانی یان کارگێڕی یان بەرزەفتکاری، یان دادگایەکی تایبەت یان دەستەڵاتێکی لێکۆڵینەوە)، کاری شارەزایی یان وەرگێڕان ئەنجامدەدات، بەڵام بە ئەنقەست ڕاستیەکە دەگۆڕێ.**

**لە ماددەی (٢٥٢)دا دەڵێ: سزا دەدرێت بە بەندکردن‌و غەرامەکردن، یان بە یەکێك لەو دووانە. ئەگەر لە ئەنجامی ئەو شایەتیدانە، (شارەزایی پێشکەش کردن) تۆمەتبار تاوانبار کرا (سزادرا)، شایەتیدەرەکە (شارەزاکە) سزا دەدرێت بەو سزایەی حوکمی تۆمەتباری پێدراوە.**

**واتە: ئەو شارەزایەی ڕاپۆرتی ساختەو درۆ دەنوسێت‌و ڕاستیەکە دەگۆڕێت سزا دەدرێت بە:**

- **بەندکردن‌و غەرامە، یان یەکێك لەو دووانە.**
- **هەچ سزایەکی تۆمەتبار بدرێت لە ئەنجامی ئەو ڕاستی گۆڕینە، هەمان سزای شارەزاکەش دەدرێت. لە هەمان کاتدا سزای شارستانیش دەدرێت بە قەرەبوکردنەوەی زیانلێکەوتوو، سزای تەمێ کردنیش دەدرێت..**

**لە ماددەی (١٨)ی یاسای ژمارە (١)ی ساڵی ٢٠٠٥ی تەندروستی دەروونیدا دەڵێ: ﴿لەگەڵ پێشێل نەکردن‌و هەڵنەوەشاندنەوەی هەر سزایەکی توندتر کە دەقی یاسای لەسەرە، سزا دەدرێت بە بەندکردن بۆ ماوەیەك لە ساڵێك زیاتر نەبێت‌و، غەرامە دەکرێت بە سەد هەزار دینار هەموو یەکێك لە:**

**أ – بە نیازپیسی زانیاری یان ڕاپۆرتێکی لە بارەی کەسێکەوە وەك نەخۆشێکی دەروونی پێشکەش کرد پێچەوانەی ڕاستی بێت، بە مەبەستی گلدانەوەی بە تەوزیمی، یان لابردنی گلدانەوەکە لەسەری.**

**ب – زانیاری یان ڕاپۆرتێکی لە بارەی (باری دەروونی) کەسێکەوە پێشکەش کرد پێچەوانەی ڕاستی بوو، ئامانجەکەشی لابردنی هەموو یان بەشێکی بەرپرسیارێتی تاوانی بێت لەسەری﴾.** [٨٦]

یاسای ژماره (٨)ی ساڵی ٢٠١٣ی تەندروستی دەروونی لە هەرێمی کوردستان، لە ماددەی (٣٨)، بڕگەی یەکەم دەڵێ: ﴿ لەگەڵ پێشێل نەکردنی هەر سزایەکی توندتر کە یاسا دەقی لەسەر بکات، ئەوا سزا دەدرێت بە بەندکردن بۆ ماوەیەك لە یەك ساڵ زیاتر نەبێتو بە غەرامەیەك لە یەك ملیۆن دینار زیاتر نەبێت، هەرکەسێك بە نیاز خراپی زانیاری یان داتا یان ڕاپۆرت بە پێچەوانەی ڕاستی دەربارەی باری دەروونی کەسێك پێشکەش بکات بە مەبەستی ئەوەی بە زۆرەکی دەستبەسەر بکرێت وەك نەخۆشییەکی دەروونی، یان بە ئامانجی کۆتایهێنانی دەستبەسەرییەکەی، یان لێبوردنی بەرپرسیارێتی تاوانکاری، چ بە شێوەیەکی تەواو یان بەشەکیی.

دووەم: سزا دەدرێت بە بەندکردن بۆ ماوەیەك لە دوو ساڵ زیاتر نەبێتو بەغەرامەیەك لە پێنجسەد هەزار دینار کەمتر نەبێتو، لە یەك ملیۆن دینار زیاتر نەبێت یان بەیەکێك لەم دوو سزایە.

١ – هەر پزیشکێك بە ئەنقەست لە ڕاپۆرتەکەی شتێك بسەلمێنێت کەوا پێچەوانەی ڕاستی بێت دەربارەی باری دەروونی یان ژیریی کەسێك بە مەبەستی ئەوەی بیخەنە دامەزراوەکان یان لێی بهێننە دەرەوە، یان بە ئامانجی ئەوەی بەشێوەیەکی تەواو یان بەشەکیی لە بەرپرسیارێتی تاوانکاری بیبورن.

**شەشەم: تاوانی ئاشکراکردنی نهێنی نەخۆش: ( افشاء سر المریض)**

نهێنی﴿ هەموو ئەو کردارانەیە لە بڵاوکردنەوەو ئاشکراکردنیدا ئەگەری ئەوە هەیە زیان بە کەسێك یان خێزانێك بگەیەنێت، ئیتر ئەو زیانگەیاندنە چ ماددی بێت، یان مەعنەوی بێت﴾. [٨٧]

نهێنی پیشەی پزیشکیی: ﴿ هەر شتێکە پزیشك لە ماوەی، یان بە بۆنەی، یان بە هۆی مومارەسە کردنی پیشەکەیەوە دەیزانێتو، لە بڵاوکردنەوەیدا زیان بە بەرژەوەندی تایبەتی خودی نەخۆشەکە، یان خێزانەکەی بگات﴾. [٨٨]

نهێنییە پزیشکییەکان زۆرجار پەیوەندیان بە مافی تاکەوە هەیەو، لەسەر بەرژەوەندی خاوەن مەبەست ڕادەوەستێت، دیارترین بنەمای سەرکەوتنی پەیامی پزیشکیی ئەو متمانەیە لە نێوان پزیشكو نەخۆشدا هەیە، ئەگەر ئەو متمانەیە لەناو بچێت لەوانەیە لە

ترسی ئاشکرا کردنی نەخۆشیەکانیانو، لە ترسی ناشیرین بوونی کەسایەتیو زڕاندنی ناوبانگیان، پەنا نەبەن بۆ پزیشك بۆ چارەسەر کردن.(٨٩)

نهێنی پزیشکیی لەو ئەرکە ئەخلاقیانەیە هەموو سەرچاوەکان سەرپێچی کردن تیایدا بە هەڵە دادەنێن کە پەیوەندی بە مرۆڤایەتی پزیشکەوە هەیە، چونکە هیچ پیشەیەکی دیکە نییە وەك پیشەی پزیشکیی نهێنی خەڵك بکەوێتە بەردەستی، چونکە پزیشك لە هەموو کەس زیاتر لە نەخۆشەوە نزیکەو، ئەو نهێنیەی بۆ پزیشکی ئاشکرا دەکات بۆ کەسی تری باس ناکات. پابەند بوون بە پاراستنی نهێنی پزیشکیی هەموو ئەو زانیاریانە دەگرێتەوە نەخۆش بە پزیشکی ڕادەگەیەنێو، ئەوانەش خودی پزیشك بە دەستی دێنێت.(٩٠)

یاسا گشتیەکانو بە تایبەت یاسا سزایەکانی زۆربەی وڵاتانی جیهان ڕێگا نادەن ئەو نهێنیانە بڵاو بکرێنەوە کە بەهۆی کارو پیشەو وەزیفەوە دەستی کەسێك دەکەوێت، بەڵکو بڵاوکردنەوەی نهێنی بە تاوان دانراوەو یاسا سزای بۆ دیاری کردوە،

یاسای سزادانی عێراقی ژمارە (١١١)ی ساڵی ١٩٦٩ی هەموار کراو لە ماددەی (٤٣٧)دا دەڵێ: ﴿هەرکەس بە حوکمی وەزیفەکەی، یان پیشەکەی، یان هونەرەکەی، یان سروشتی کارەکەی نهێنیەکی زانیو، بۆ سودی خۆی یان بۆ سودی کەسانی دیکە بڵاوی بکاتەوە لە دۆخێکدا یاسا ڕێگای نەدابێت، سزا دەدرێت بە بەندکردن بۆ ماوەیەك لە دوو ساڵ زیاتر نەبێتو، غەرامە دەکرێت بە بڕێك لە (٢٢٥٠٠٠) دینار زیاتر نەبێت، یان سزا دەدرێت بە یەکێك لەو دوو سزایە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر کەسی پەیوەنددار ڕێگای بە بڵاوکردنەوەدا، یان بڵاوکردنەوەکە بە مەبەستی هەواڵدان بێت لە تاوانێك یان کەتنێك ڕێگا بگرێت لە ڕودانیان سزای لەسەر نییە﴾.

یاسای سەلماندنی عێراقی ژمارە (١٠٧)ی ساڵی ١٩٧٩ی هەموارکراو لە ماددەی (٨٨)دا دەڵێ: ﴿ فەرمانبەرانو ئەوانەی ڕاژەی گشتیان پێسپێراوە، نابێت ئەو زانیاریانەی لە کاتی ئەنجامدانی ئەرکەکانیاندا دەستیاندەکەوێت، بڵاوی بکەنەوەو بیدرکێنن، هەتا پاش وازهێنانیشیان لە کارەکانیان، ئەگەر بە ڕێگەی یاسایی بڵاونەکرابێتەوەو، لایەنی تایبەتمەند مۆڵەتی نەدابێت، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو لایەنە بۆی هەیە مۆڵەتیان بدات بە گەواهیدان لەسەر داوای دادگا. یان یەکێك لە نەیارەکان﴾.

له برگەی یەکەمی ماددەی چلو یەکەمی یاسای ژمارە (٨)ی ساڵی ١٩٩٩ سەندیکای دەرمانسازەکانی هەرێمی کوردستان دەڵێ: ﴿ هەرکەسێك نهێنییەك لە نهێنییەکانی نەخۆشی دەروونی بە پێچەوانەی حوکمەکانی ئەم یاسایە ئاشکرا بکات ئەوا سزا دەدرێت بە غەرامەیەك لە یەك ملیۆن دینار کەمتر نەبێتو لە دوو ملیۆن دینار زیاتر نەبێت.

لە هەمان کاتدا یاسا ڕێگای داوە لە هەندێك حاڵەتدا نهێنییەکان بدرکێنرێنو، ئاشکرا بکرێن، پابەندبوون بە شاردنەوەی نهێنییەکانی خەڵکان ئەرکێکی ئەخلاقیەو. پرەنسیپەکانی ئەمانەت پارێزی دەیخوازێت، چونکە گرنگی نهێنی ئەوەیە بەستراوە بەژیانی تایبەتی تاکەوەو، لایەنێکە لە گرنگترین لایەنەکانی ئازادی تاکەکەسیو، لە بنەڕەتدا تاکەکان ماف پاراستنی نهێنییەکانیان هەیەو، دەشتوانن بیدرکێنن بۆ کەسێك کەجێی متمانە بێت، بەڵام دەبێت ئەوەی نهێنییەکەی بۆ باسکراوە بیشارێتەوە، چونکە پاراستنی نهێنی تایبەتمەندیەکە لە تایبەتمەندیە کۆمەڵایەتیەکانو، لە هەمان کاتدا دەشبێتە ئەرکێکی ئەخلاقی. [٩١].

## لقی سێیەم

## هۆکانی ڕێپێدانی ئاشکرا کردنی نهێنی پزیشکیی

ئەگەرچی بڵاوکردنەوەی نهێنی پزیشکیی بە شێوەیەکی گشتی یاساغە، بەڵام لە هەندێك حاڵەتدا یاسا ڕێگای داوە ئەو نهێنیانە بدرکێنرێن، ئیتر بۆ بەرژەوەندی گشتی بێت، یان بۆ بەرژەوەندی تایبەت بێت، یان کەسی تایبەتمەند ڕێگای بە بڵاوکردنەوەی دابێت، چونکە ئەگەر پاراستنی نهێنی مافی تاك بپارێزێت، ئەوە درکاندنی مافی کۆمەڵگە دەپارێزێ، هەمووان دەزانین مافی کۆمەڵگە لە پێش مافی تاکەوەیە.

**لەو هۆکارانەش ڕێگا بە درکاندنی نهێنییەکان دەدەن ئەمانەن:**

**١ – بۆ ئاشکراکردنی تاوان:**

یاسادانەر هەموو پزیشکێکی پابەند کردووە هەر ڕوداوێك، یان زانیاریەکی دەست دەکەوێت پەیوەندی بە تاوانێکەوە هەبێت بیگەیەنێت بە دەسەڵاتی تایبەتمەند. [٩٢].

ئەگەر هەواڵەکەی ڕانەگەیاند، یاسا سزای بۆ پزیشك داناوە، بەوەی بێ دەنگی لە ڕاگەیاندنی تاواندا کردووە. لە ماددەی (٤٩٨)ی سزادانی عێراقیدا دەڵێ:﴿ هەموو خاوەن پیشەیەکی پزیشکیی یان تەندروستی لە کاتی پشکنین یان فریاکەوتنی مردوویەك، یان پێکراوێکدا دیتی نیشانەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن مردنەکە یان پێکانەکە لە ئەنجامی تاوانێك بووە و، ئاگاداری دەسەڵاتی نایبەتمەندی نەکرد، سزا دەدرێت بە بەندکردن بۆ ماوەیەك لە سێ مانگ زیاتر نەبێت، یان غەرامە دەکرێت بە بڕێك لە ( ٤٥٠٠٠) دینار زیاتر نەبێت ﴾.

٢ – بۆ پاراستنی تەندروستی گشتی:

ئەگەر لە بناغەدا پاراستنی نهێنی پزیشکیی گشتی ڕەهابێت، بێگومان ئەوە بۆ بەرژەوەندی نەخۆشە، خۆ ئەگەر بەرژەوەندیەکی گشتی هەبوو لە پاراستنی نهێنی نەخۆشەکە گەورەتربوو، ئیتر ئەو نهێنیە بە نهێنی نامێنیێ و، بڵاوکردنەوەو درکاندنی بە تاوان ناژمێریێ و سزای لەسەر نییە، بەڵکو درکاندنی نهێنیەکە دەبێتە ئەرك. (٩٣).

مەبەست لە تەندروستی گشتی پاراستنی تەندروستی تاکەکانە لە هەرشتێك زیانی پێبگەیەنێت، وەك نەخۆشیە درمەکان، بۆیە دەسەڵاتی کارگێڕیی ڤاکسین دەدات بە منداڵ و، دژی نەخۆشیە درمەکانیش دەیانکوتیێ و، هەموو ڕێکارێکی بڵاونەبونەوەیان دەگرێتەبەر. (٩٤).

کاتێك پزیشکێك گومانی ئەوەی بۆ دروست بوو نەخۆشەکە توشی نەخۆشیەکی گواستراوە بووە، دەبێت لەو بارەوە لایەنی فەرمی تەندروستی ئاگادار بکاتەوە.

لە ماددەی (٣٦٩)ی یاسای سزادانی عێراقی ژمارە (١١١)ی ساڵی ١٩٦٩ی هەموارکراودا دەڵێ: ﴿ سزا دەدرێت بە بەندکردن بۆ ماوەی لە ١ ساڵ زیاتر نەبێت یان بە غەرامە کردن لە (٢٢٥٠٠٠) دینار زیاتر نەبێت، هەر کەس بە هۆی هەڵەکردنییەوە بوو بە هۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکی مەترسیداری زیان بەخش بۆ ژیانی مرۆڤ ﴾ . ڕاگەیاندنی نەخۆشیەکە بە دەسەڵاتی فەرمی تەندروستی بۆ گەمارۆدانی نەخۆشیە درمەکانە پێش بڵاوبوونەوەیان بە شێوەیەکی بەرفراوان. خۆ ئەگەر پزیشك نەخۆشیە مەترسیدارەکانی نەگەیاند بە دەسەڵاتی تەندروستی، ئەوە بە ئەنقەست چاوپۆشی لە بڵاوبوونەوەی ئەو نەخۆشیە کردووە، بەوەش هەڵەی ئەنجامداوەو، دەکرێت سەرپێچی ماددەی(٣٦٩)

یاسای سزادانی عیراقی کردبێتو، سزاکەش بیگرێتەوە. ماددەی (٤٩٨)ی یاسای سزادانی عێراقی سزای بەندکردن بۆ ماوەیەك لە سێ مانگ زیاتر نەبێت، یان (٤٥٠٠٠) دیناری داناوە بۆ بۆ ئەو پزیشكو تەندروستكارانەی حاڵەتێكی گوماناوی دەبینن‌و هەاڵەكە ناگەیەنن بە دەسەڵاتی تایبەتمەند.

ڕێنمایەكانی ژمارە (١)ی ساڵی ٢٠٠٧ ئەو نەخۆشیە درمانەی دیاری كردووە كە دەبێت هەواڵیان لە بارەوە بدرێت، بە پشت بەستن بە حوكمەكانی ماددەی (٤٥) لە یاسای تەندروستی گشتی ژمارە (٨٩)ی ساڵی ١٩٨١، ئەم ڕێنمایانەمان بڵاو كردەوە،

**ڕێنمایەكانی دیاریكردنی نەخۆشیە گواستراوەكان:**

**ماددەی – ١ – نەخۆشیە گواستراوەكان لەم گروپانەدا دیاری دەكرێن.**

**یەكەم: گروپی یەكەم:**

أ – كولێرا (cholera)

ب – ئێسكەنەرمەو ئیفلیجی منداڵ (Tick & Infantile paralysis)

ج – ئایدز (VIH)

د – تای خوێنبەربوون (Haemorage Fever)

هـ – مەلاریا، لەرزوتا (Malignant Malaria)

و – وەناق، دووشاخە (Diphtheria)

ز – سورێژە (Measles)

ح – ژەهراویبون بە خواردن (Food poisoning)

گ – دەردەكۆپان (Tetanus)

ی – هەوكردنی پەردەی مێشك (Meningitis)

ك – چاوەقوڵە (Plague)

ل – زەردویی (Jaundice)

م – تای ڕشانەوە (Relapsing fever)

ن – لاڕەشەی سی (Lung Anthrax)

س – ڕەشە گرانەتا (Typhus)

ع – سورێژەی ئەڵمانی (German Measles)

غ _ دەردە پشیلە (Toxoplasmosis)

ف _ تورەکەی ئاو (Hydatid cysts)

دووەم: گروپی دووەم:

أ – هاری (Rabies)

ب – کۆکەڕەشە ( Whooping cough)

ج – کوانوی خورما (Lieshmaniasis)

د – هەوکردنی جگەر جۆری (ب) (Hepatitis group B)

ه – سکچونی باسیلی (shegilia dysentery)

سێیەم: گروپی سێیەم:

أ – هەوکردنی جگەر هەموو جۆرەکان (Hepatitis All group)

ب – تای ماڵتا (Brucellosis)

ج – دڕکەومێکوتە (chicken pox)

د – بلهارزیا (Belharisia)

ه – هەوکردنی ڤایرۆسی پەردەی مێشك ( viral Meningitis)

و – هەوکردنی میکرۆبی پەردەی مێشك (Bacterial Meningitis)

ز – ملەخرە (Mumps)

ح – سیلی سنگ (Lung Tuberculosis)

گ – سیلی دەرەوەی سنگ (Out of lung tuberculosis)

ی – نەخۆشیە سێکسیەکان (sexual Disease)

ك – گولی (leprosy)

ل – گەڕی (Mange)

م – مەلاریا (Malaria)

ن – هەوکردنی سی (pneumonia)

س – گازگرتنی ئاژەڵ (Animal Bite)

ع – گرانەتا (Typhoid)

ف – لاڕەشە (skin Anthrax)

ص – ئەنفلۆنزا (Flu)

ماددەی -٢-

یەکەم: ئەو خاوەن پیشە پزیشکیی‌و تەندروستیانە کە لە دەزگا تەندروستیەکاندا کار دەکەن، هەر کات نەخۆشیەك لە نەخۆشیەکانی گروپی یەکەمی بەندی یەکەمی ماددەی یەکەمی ئەم ڕێنمایانەی بۆ دەرکەوت، دەبێت خێراو بە هەر ئامرازێك دەگونجیٚ لە ماوەی (٢٤) کاژێردا هەواڵ بگەیەننە لایەنی باڵای تەندروستی.

دووەم: ئەو خاوەن پیشە پزیشکیی‌و تەندروستیانە کە لە کەرتی، تایبەتدا کاردەکەن، هەرکات نەخۆشیەك لە نەخۆشیە گواستراوەکان کە لە ماددەی (١)دا هاتووە دەرکەوت،

دەبێت لە ماوەی (٢٤) کاژێردا، بە هەر ئامرازێك دەگونجێ ئاگاداری نزیکترین دەزگای تەندروستی فەرمی بکەن.

ماددەی -٣-

سەرپێچی کردنی حوکمەکانی ماددەی (٢)ی ئەم ڕێنمایانە بە پێی ماددەی (٩٦)ی یاسای تەندروستی گشتی ژمارە (٨٩)ی ساڵی ١٩٨١ سزا دەدرێت.

دەبینین هەواڵ نەگەیاندن لەو بارانەدا بە سەرپێچی کردن دادەنرێت.

**٣ – بۆ ئاشکرا کردنی نەخۆشیەکە بە ڕەزامەندی نەخۆشەکە:**

بە پێی ماددەی (٤٣٧)ی یاسای سزادانی عێراقی درکاندنی نهێنی نەخۆش ئەگەر بە ڕەزامەندی نەخۆش‌و کەسی پەیوەندیدار بوو بە تاوان دانانرێت، نەخۆش وەك چۆن دەتوانێت نهێنیەکانی خۆی بڵاو بکاتەوە، بە هەمان شێوە دەتوانێت ڕێگا بدات پزیشکیش ئەو نهێنیە بدرکێنێ، ئیتر ئەو درکاندنە بۆ بەرژەوەندی نەخۆشەکە بێت، یان بۆ بەرژەوەندی کەسێکی دیکە بێت. [٩٥].

خۆ ئەگەر ڕوداوەکان یان زانیاریە پەیوەندارەکان ناوبانگی نەخۆشەکەی لەکەدار دەکرد، لەو بارەدا نابێت زانیاریەکان بڵاو بکرێنەوە بۆ خەڵك، دەبێت ڕەزامەندی نواندن لە خودی نەخۆشەکەوە بێت‌و، ڕەزامەندیەکە دروست بێت‌و، جێی بایەخی یاسا بێت‌و، ڕەزامەندی کەسی تر جێی بایەخ نییە. [٩٦].

**٤ – بۆ ئەنجامدانی شارەزایی پزیشکیی:**

ئەگەر دادگا داوای لە پزیشك کرد وەك شارەزا پشکنین بۆ کەسێك بکات، ئەوە پابەند بوونی پاراستنی نهێنی لەسەر هەڵدەگیرێت‌و، لەو پابەندبوونە ڕەها دەبێت، بەڵکو ناچار دەبێت هەموو ڕوداوەکە لە ڕاپۆرتێکدا بنوسێت‌و. بەرزی بکاتەوە بۆ لایەنی پەیوەندیدار. [٩٧].

دەبێت پزیشك لە کاتی مومارەسەکردنی کارەکەی وەك شارەزا، نهێنیەکان تەنیا بۆ ئەو لایەنە بدرکێنێ کە ڕایسپاردوە، ئەو ڕاسپاردنەش لە لایەن دادگاوە دەبێت _ بە مەبەستی سەلماندن‌و نەسەلماندنی تاوانێك-، بە هەمان شێوە لە لایەنی کارگێڕی گشتیشەوە

رادەسپێرێ بۆ پشكنینی ئەوانەی دەیانەوێت كار بكەن، تا بڕیار بدات لەسەر شیاویان. یان پشكنین بكات بۆ فەرمانبەرێك تا بزانێت چەندە مۆڵەتی پێویستە، یان پشكنین بكات بۆ ئەو فەرمانبەرەی بە هۆی كارەكەیەوە پێكراوە، تا بڕی قەرەبوی بۆ بخەملێنرێ. ئەو راپۆرتەی پێشكەش بە كارگێڕی دەكرێت، بە دركاندن و ئاشكرا كردنی نهێنی ناژمێردرێ. [٩٨]

**٥ – بۆ شایەتیدان لە بەردەم دادگادا:**

ماددەی (٨٨)ی یاسای سەلماندنی ژمارە (١٠٧)ی ساڵی ١٩٧٩ی هەمواركراو، ڕێگا دەدات پزیشك لەسەر داوای نەیارەكان یان دادگا بە مەبەستی لێكۆڵینەوە نهێنیە پزیشكیەكان بدركێنێ، ئەو شایەتیدانەش بۆ پاراستنی دادپەروەریی و، بەرژەوەندی كەس و لایەنێكە. خۆ ئەگەر پزیشك ئامادەنەبوو شایەتی بدات، دەكرێت بە پێی ماددەی (٩٣)ی هەمان یاسا بە سزای شایەتی نەدان سزا بدرێت.

**٦ – ئاشكراكردنی نهێنی بۆ بەرگری لە خۆ:**

بۆچونی قەزاو فەقیهەكان لەسەر ئەوە جێگیر بووە پزیشك مافی ئەوەی هەیە بۆ بەرگری لە خۆی نهێنیەكان ئاشكرا بكات، وەك ئەو كاتانەی تۆمەتبار بكرێت بە لەباربردن، یان زەوتكردن، یان هەڵەكردن لە چارەسەركردندا، دەبێت ئەو پەڕاوە پزیشكیانە بخاتە ڕوو ئەوە دەسەلمێنێ كە بێتاوانە، ئەو ئاشكرا كردنەش دەبێت لە بەردەم دەسەڵاتی لێكۆڵینەوە یان دادگادا بێت. [٩٩]

پزیشك ماق ئەوەی هەیە لە پێناو بەرگریكردن لە خۆی ئەو شتانە بخاتە ڕوو كە بێتاوانی دەسەلمێنێت، ماق بەرگری كردن لە مافە بنەڕەتیە دانپیانراوەكانی تۆمەتبارەو، پابەندبوونی پاراستنی نهێنی ئەو مافە هەڵناوەشێنێتەوە، بەڵكو بۆ دەرخستنی ڕاستیەكان و، ڕاماڵینی ئەو تۆمەتانەی ئاراستەی كراوە ماق ئەوەی هەیە ڕونكردنەوە بدات. [١٠٠]

## لقی چوارەم

## بەرپرسیارێتی شارستانیو قەرەبوکردنەوە

### یەکەم: پێناسەی بەرپرسیارێتی:

سەرپێچی کردنی کەسێکە لە ئەنجامدانی ئەو کارەی بە یاسا یان بە پابەندبونێک دەکەوێتە ئەستۆی. ئەم بەرپرسیارێتیە لە ئەنجامی سەرپێچی کردنی تاکە لە پابەندبوونی نێوان دوو لایەن کە زیان بە لایەنێکیان گەشتووە، بەرامبەری ئەو زیانگەیاندنەش قەرەبوو کردنەوەیە.

لێرەدا بەرپرسیارێتی واتە: پابەندبوونی کەسێك بە قەرەبووکردنەوەی ئەو زیانەی بە کەسانی دیکەی گەیاندوە، ئەوەش لە ئەنجامی سەرپێچی کردنی ڕێسایەکی یاسایی، یان گرێبەستێك، یان ئەو پابەندبوونەی لە ئەستۆیدایە.[١٠١]

بەرپرسیارێتی شارستانی: ئەو کۆمەڵە ڕێسایەیە کە زیاندەر پابەند دەکات قەرەبووی زیانلێکەوتوو بکاتەوە، یان زیانەکە چاك بکاتەوە.[١٠٢]

بەڵام لە لایەنی پزیشکییەوە مەبەست لە بەرپرسیارێتی شارستانی هەموو ئەو کارە ئەرێنیو نەرێنیانەن کە پزیشکانو کارمەندانی تەندروستی دەیکەنو، زیان بە نەخۆش دەگەیەنن، پێویستە لێپرسینەوەو لێپێچینەوەی یاساییان لەگەڵدا بکرێت، کە زۆربەیان خۆی لە قەرەبوکردنەوەدا دەبینێتەوە. کاتێك باسی بەرپرسیارێتی شارستانی پزیشك دەکەین، مەرج نییە لێپرسینەوە تەنیا لەو کاتانەدا بێت کارێك ئەنجام دەدات، بەڵکو لەوانەیە لێپرسینەوە لەسەر ئەنجامنەدانی کارێك بێت. لە لایەنی یاساییەوە بەرپرسیارێتی مەدەنی پزیشك کاتێك دروست دەبێت پزیشكو کارمەندان سەرپێچی ئەو پابەندبوونە بکەن لە ئەستۆیاندایەو، لە ئەنجامدا زیانێکی ماددی یان مەعنەوی بگەیەنن بە نەخۆش. لەوانەیە سەرچاوەی ئەو سەرپێچییەش ڕێکەوتن، یان گرێبەستی پزیشکی بێت.[١٠٣]

بەرپرسیارێتی شارستانی لە بارو دۆخێکدا دەبێت کەسێك کارێك ئەنجام بدات سەرپێچی کردنی ڕێساکانی یاسا بێتو، پێویستبێت زیانەکەی پێ ببژێرێ، وەك سەرپێچی کردنی

پزیشکێك لە پابەندبوونێکی دیاریکراو ئەنجامەکەی زیان بە کەسانی دیکە بگەیەنێت. لە زۆربەی یاسا شارستانیەکاندا هاتووە: بەرپرسیارێتی ئەوەیە هەموو کەسێك بەرپرسیارە لە کردارەکانی.[١٠٤]

دووەم: **جۆرەکانی بەرپرسیارێتی شارستانی:**

**١ – بەرپرسیارێتی گرێبەستی (المسؤلية العقدية):**

بەرپرسیارێتی گرێبەستی دەکەوێتە ئەستۆی هەموو گرێبەستکارێك کە پابەند نەبێت بە جێبەجێکردنی گرێبەستەکەوە، مەبەست لەو بەرپرسیاریەتیەش قەرەبوو کردنەوەی ئەو زیانەیە لە جێبەجێ نەکردنی گرێبەستەکە دەکەوێتەوە.[١٠٥]

سروشتی گرێبەستی نێوان پزیشكو نەخۆش: بەپێی ئەو گرێبەستە پزیشك پابەند دەبێت بە چاودێریەکی وریای نەخۆش بەو شێوەی بارودۆخی نەخۆش دەیخوازێت، چاودێری کردنێك لەگەڵ پیشەی پزیشکیو پێشکەوتنەکانی سەردەمدا گونجاو بێت. هەر سەرپێچی کردنێك لەو پابەندبوونەدا دروست ببێت بەرپرسیارێتی پزیشك دروست دەبێت، ئەو بەرپرسیاریەش کاتێك دروست دەبێت پزیشك هەڵە بکاتو، لە هەڵەکەشەوە زیان بە نەخۆش بگات.[١٠٦]

**٢ – بەرپرسیارێتی درێخی کردن (المسؤلية التقصيرية):**

بەرپرسیارێتی درێخی کردن ئەو پێبژاردنەیە لە پێشێلکردنی پابەندبوونێکی یاسایی دەکەوێتە ئەستۆی پزیشك، پێوەری ئەو بەرپرسیاریەش لادانی پزیشکە لە ڕەفتارو هەڵسوکەوتیدا لە بوونی وریاییو بەرچاوڕوونیو، بەتەنگەوە نەبوونی پێویست بۆ نەخۆشەکە، هەرکات لە نێوان نەخۆشو پزیشکدا گرێبەست نەبوو، هەموو بەرپرسیاریەك دەچێتە چوارچێوەی بەرپرسیارێتی درێخی کردن.

**ئەم حاڵەتانەش بە بەرپرسیارێتی درێخیکردن دادەنرێن:**

* چارەسەرکردن بە هەڵە یان بە ناتەواوی.

* فریانەکەوتنو یارمەتینەدانی نەخۆش، کاتێك لە بارێکی مەترسیداردا بێت.

* کاتێك له ئه‌نجامی كه‌مته‌رخه‌می‌و چاودێرینه‌كردنی پزیشك، نه‌خۆشه‌كه زیان به كه‌سانی دیكه بگه‌یه‌نێت.

* پێشێلكردنی هه‌ر پابه‌ندبونێكی یاسایی كه ده‌قه‌كانی یاسای شارستانی ڕێكی ده‌خات‌و كۆنترۆڵی ده‌كات. (١٠٧).

**سێیه‌م: قه‌ره‌بوكردنه‌وه:**

ئه‌گه‌ر سێ پایه‌كه‌ی به‌رپرسیارێتی درێخی كردن ( هه‌ڵه‌و زیان‌و په‌یوه‌ندی هۆیه‌تی) هاتنه دی‌و، توانرا بسه‌لمێنرێن ئه‌وه حوكمی قه‌ره‌بوكردنه‌وه‌ی لێ ده‌كه‌وێته‌وه، قه‌ره‌بوكردنه‌وه ئامڕازی دادوه‌ریه بۆ ساڕێژكردنی زیان، به نه‌هێشتن یان كه‌مكردنه‌وه‌ی زیانه‌كه، قه‌ره‌بوكردنه‌وه‌ش له‌گه‌ڵ زیاندایه به بوون‌و نه‌بوون، - واته تا زیان نه‌بێت قه‌ره‌بوش نییه- ده‌بێت بڕی قه‌ره‌بوش هاوتای زیان بێت‌و، نابێت زیاتر یان كه‌متر بێت، تا نه‌بێت به سزادان بۆ زیانده‌رو، نه‌شبێت به سه‌رچاوه‌ی قازانج بۆ زیان لێكه‌وتوو، قه‌ره‌بوو سزادان نییه بۆ (ردع) سڵه‌ماندنه‌وه‌ی هه‌ڵه‌كار، به‌ڵكو ساڕێژكردنی زیانه، قه‌ره‌بوو یان نه‌ختێنه‌یه، یان نه‌ختێنه نییه، یان له بری زیانێكی ماددی یه یان زیانێكی ئه‌ده‌بی (معنوی)، له بنه‌ڕه‌تدا ده‌بێت بڕی قه‌ره‌بوو به (دراو) نه‌ختێنه بخه‌مڵێنرێ، واته: له داواكاری به‌رپرسیاێتی درێخی كردندا شێوه‌ی باوی قه‌ره‌بوكردنه‌وه به دراوه. (١٠٨). ئه‌مه‌ش ئه‌و ئاراسته‌یه دادگای پێداچونه‌وه له‌سه‌ری ده‌چێت. بڕیاری دادگای پێداچونه‌وه‌ی فیدراڵی ژماره ٣٥٧٢/م٢٠٠٨/٣ له ٢٠٠٨/١/٢٦ ده‌ڵێ: ( داواكار شایانی قه‌ره‌بوكردنه‌وه‌ی شارستانی یه، بۆ ئه‌و زیانه‌ی به‌ری كه‌وتووه،مه‌به‌ستی قه‌ره‌بوكردنه‌وه (جبر) ساڕێژكردنی ئه‌و ئازارو ته‌نگژه ده‌روونیه‌یه به‌ر زه‌ره‌رمه‌ند كه‌وتووه نه‌ك ده‌وڵه‌مه‌ند بوون له‌سه‌ر زیانگه‌یه‌نه‌ر. (١٠٩).

**١ - پێناسه‌ی قه‌ره‌بوو:**

قه‌ره‌بو بڕێك پاره، یان هه‌ر ڕازیكردنێكه له ڕه‌گه‌زی زیانه‌كه، هاوتای ئه‌و زیانه بێت له زه‌ره‌رمه‌ند كه‌وتووه‌و، ئه‌و ده‌سكه‌وته‌ش (كسب) له ده‌ستی ده‌رچووه ئه‌گه‌ر ئه‌نجامی سروشتی كرداره زیانبه‌خشه‌كه بێت. (١١٠). قه‌ره‌بوو ئه‌و بڕه دارایه‌یه كه قه‌رزار پابه‌ند ده‌كرێت بیدات به قه‌رزده‌ر له بری ئه‌و زیانه‌ی پێی گه‌شتووه. (١١١). مادده‌ی (٢/١٦٩)ی یاسای شارستانی عێراقی ئاماژه‌ی به قه‌ره‌بوكردنه‌وه كردوه‌و ده‌ڵێ: ( قه‌ره‌بوكردنه‌وه له

بری هەموو پابەندبونێك دەبێت لە گرێبەستەوە دروست دەبێت، بە گواستنەوەی موڵكێك یان سودێك یان هەرمافێكی (عینی)، یان پابەند كردن بە كردن یان نەكردنی كارێك، ئەو خەسارە لێی كوتووەو ئەو دەسكەوتەش لەدەستی چووە دەگرێتەوە كە بە هۆی فەوتانی مافەكەی یان بە هۆی دواخستنی بووە، بە مەرجێك ئەمە ئەنجامی سروشتی نەكردن یان دواخستنی قەرزار بێت).

**٢ – ئەو رێسا گشتی یانەی قەرەبووی لەسەر دیاری دەكرێت:**

أ: بڕی قەرەبوكردنەوە بەگوێرەی گەورەیی زیانەكە دیاری دەكرێت، نەك بەگوێرەی گەورەیی هەڵەكە.

ب: لە خەمڵاندنی بڕی قەرەبوكردنەوەدا دەبێت قەبارەی ئەو زیانە لەبەرچاو بگیرێ كە لە داواكار كەوتووە.

ج: لە خەمڵاندنی بڕی قەرەبودا ڕەچاوی دۆخی زیان لێكەوتوو بكرێت.

د: نابێت زیان لێكەوتوو لە یەك كاتدا لەسەر یەك زیان دوو قەرەبوو وەربگرێت.

هـ: لە حاڵەتی فرەیی بەرپرسیاران بەپێی ڕێژەی بەشداریكردنی هەریەكەیان لە زیان گەیاندنەكە بڕی قەرەبوو دەخەمڵێنرێ.

و: پەیرەولێكراو (متبوع) دەتوانێت بگەڕێتەوە سەر پەیرەوكار (تابع) بە ئەندازەی ئەو زیانەی بە زیان لێكەوتوی گەیاندوە.

ز: نابێت بڕی قەرەبوكردنەوە لەو بڕە زیاتر بێت كە زیان لێكەوتوو داوای كردوە.

ح: بڕی قەرەبوكردنەوە دەبێت بەرامبەری زیانی ڕاستەقینە بێت. [١١٢]

**چوارەم: جۆرەكانی قەرەبوو كردنەوە:**

**١ – قەرەبوكردنەوەی (عینی) گەڕانەوە بۆ باری پێشو:**

واتە گەڕاندنەوەی دۆخەكە بۆ پێش ڕودانی زیانەكە، ئەمە لە بەرپرسیارێتی گرێبەستیدا بوارێكی فراوانی هەیە، بەڵام لە بواری بەرپرسیارێتی درێخی كردندا لە سنورێكی

بەرتەسکدا جێبەجێ دەکرێت. ئەو کەسەی لە کاری پزیشکیدا هەڵە دەکات، بۆ نموونە پزیشکێك لە نەشتەرگەریەکدا هەڵە بکاتو، ڕواڵەتی نەخۆشەکە تێکبدات، دەکرێت لە ڕێی نەشتەرگەریەکی ترەوە ئەو تێکچونە لابەرێتو چاکی بکاتەوە، لێرەدا دادوەر دەتوانێت پزیشك پابەند بکات لە ڕێی نەشتەرگەریەکی ترەوە زیانەکە چاك بکاتەوە، لەم بارەیەوە ماددەی (١/٢٤٦)ی یاسای شارستانیدا دەڵێ: ( هەرکات گونجاوبوو قەرزار ناچار دەکرێت پابەندبونەکەی بە شێوەی (عینی)، گەڕانەوەی بۆ باری پێشو. بەڵام لە هەندێك باردا ئەوە ناکرێت، وەك ئەو زیانەی پزیشکێکی نەشتەرگەر بۆ نەخۆشێکی دروست کردوە لە پسپۆڕی پزیشکێکی تر بێت، لەم حاڵەتەدا ناچارین قەرەبوکردنەوەی زیانەکە بە بەرامبەر بێت، چونکە پزیشکەکە بوو بە نەیار، بۆیە ناتوانێت کارەکەی بە جوانی ئەنجامبدات. لە بەرپرسیارێتی پزیشکیدا هەندێکجار قەرەبووی (عەینی) هەرگیز ناکرێت، وەك ئەو هەڵەی دەبێتە هۆی مردنی نەخۆش یان کوێرکردنی یان بڕینەوەی لاقێکی، لەم دۆخەدا قەرەبوکردنەوە تەنیا بە دراو دەبێت، لە ڕاستیدا دادگا هەمیشە بڕی قەرەبوو کردنەوە بە دراو دەخەمڵێنێت مەگەر لە کاتێکدا زیانلێکەوتوو داوای قەرەبوی (عەینی) بکات. ماددەی (٢/٢٠٩)ی شارستانی دەڵێ: ( قەرەبوو کردنەوە بە دراو دەخەمڵێنرێ، لە هەمانکاتدا دروستە دادگا بەپێی بارودۆخ و لەسەر داوای زیان لێکەوتوو فەرمان بدات بە گێڕانەوەی دۆخەکە بۆ باری پێشوو).

## ٢ – قەرەبوکردنەوە بە دراو:

لەبەر ئەوەی قەرەبوکردنەوەی (عینی) لە بەرپرسیارێتی پزیشکیدا کارێکی گرانەو، ناتوانرێت لە پێکانی جەستەدا وەك بڕینەوەی لاقێکی نەخۆش جێبەجێ بکرێت، بۆیە بە شێوەیەکی گشتی قەرەبوکردنەوە بە دراو (پارە) دەخەمڵێنرێ، لە ماددەی ( ٢/٢٠٩) دەڵێ: ( قەرەبوکردنەوە بە نەختێنە دەخەمڵێنرێ ...)، لەبەر ئەوەی دراو ئامرازی ئاڵوگۆڕ پێکردن و خەمڵاندنە، بۆیە دەتوانرێت زیانی ماددی و مەعنەوی بە دراو بخەمڵێنرێ.

### أ: قەرەبوکردنەوەی زیانی ماددی و مەعنەوی:

بەپێی حوکمەکانی یاسای شارستانی عێراقی لە بواری بەرپرسیارێتی درێخی کردندا قەرەبوی زیانی ماددی و مەعنەوی دەکرێتەوە، ماددەی (١/٢٠٥)ی یاسای شارستانی دەڵێ: ( مافی قەرەبوکردنەوە زیانی مەعنەویش (ئەدەبی) دەگرێتەوە، هەموو دەستدرێژی

کردنێك بۆسەر ئازادی، ناموس، شۆرەتو ناوبانگ، یان پێگەی کۆمەڵایەتی کەسێك دەستدرێژیکار بەرپرسە لە قەرەبوکردنەوەی).

لە بڕگەی (٢)دا دەڵێ: ( دروستە قەرەبوی هاوسەرو نزیکەکانی خێزان بکرێتەوە لەو زیانە ئەدەبیەی بە هۆی مردنی پێکراوەکەیانەوە بەریان کەوتووە).

لە بڕگەی (٣)دا دەڵێ: ( لە زیانی ئەدەبیدا قەرەبوو ناگوێزرێتەوە بۆ کەسی دیکە ئەگەر بەهاکەی بەپێی ڕێکەوتن یان حومکمێکی کۆتایی دیاری نەکرابێت). پوختەی قسان ئەوەیە قەرەبوکردنەوەی زیانی ماددی بەهایەکی داراییە زیاد دەکرێت بۆ زیان لێکەوتوو. بەبێ ئەوەی پێویستی بە ڕێکەوتن یان بڕیاری دادگا هەبێت، بەڵام قەرەبوکردنەوە لە زیانی ئەدەبیدا ناگوێزرێتەوە بۆ کەسی تر بەپێی ڕێکەوتن یان بڕیاری کۆتایی دادگا نەبێت، چونکە لەو ڕێگایەوە نەبێت بەهای دارایی نییە.[١١٣]

**ب: بۆچی قەرەبوکردنەوەی ئەدەبی بەهای دارایی هەیە بەڵام ناگوێزرێتەوە؟**

**وەڵام:** چونکە قەرەبوەکە مافێکە تایبەتە بە کەسی زیان لێکەوتوو، تا قەرزار ددانی پێدا نەنێت، یان زیان لێکەوتوو لە دادگا داوای نەکات قەوارەی بۆ دروست نابێت. شایانی باسە قەرەبووی زیانی ماددی بەوکەسانە دەدرێت یاسای شارستانی عێراقی لە ماددەی (٢٠٣)دا دیاریکردووە: کە دەبێژێ ( لە حاڵەتی کوشتنو، مردن بە هۆی برینەوە، یان هەر کردارێکی زیانبەخشی تر، ئەوەی زیانەکەی دروست کردوە بەرپرسیارە لە قەرەبوکردنەوەی ئەو کەسانەی کە پێکراوەکە بە خێوی دەکردنو، بەهۆی ئەو مردنەوە لە بەخێوکردن بێبەش بوون). بەڵام ئەو قەرەبوکردنەوەی بۆ میراتگران دەڕوات، ئەوەیە کە دەچێتە سەر (ذمة) ئەستۆی دارایی زیان لێکەوتوو، لە ژیانی پێکراوەکەدا بڕەکەی دیاری کراوە، _ جیاوازی نییە زیانی ماددی یان مەعنەوی بێت- ئەوکات بەپێی ئەحکامەکانی میرات بەسەر میراتگراندا دابەش دەکرێت.

دادگای پێداچونەوەی عێراقی لە بڕیاری ژمارە ١١٦٥/م منقول/٢٠٠٢ لە ٢٠٠٢/٢/١٨ بەم شێوە بڕیاریدا ( وەزیری تەندروستی سەرەڕای ئەرکەکەیو پزیشکی شیکاری (ن.ن)و دکتۆرە (ر.ل) پابەند کران بە پێدانی بڕێك پارە بەو داواکارەی بە مەبەستی نەشتەرگەری برایە نەخۆشخانەو، بە هۆی کەمتەرخەمیەوە لەکاتی گواستنەوەی خوێندا توشی نەخۆشی (ئایدز) بووە. بەهەمان شێوە لە ٢٠٠٢/١٢/١٠ دادگای پێداچونەوە پەسەندی

بڕیارێکی دادگای سەرەتایی دیوانیەی کرد، کە بە ژمارە ٥٠٥/ب/٢٠٠١ لە بەرواری ٢٠٠٢/٣/٦ پابەندی وەزیری تەندروستی سەرەڕای ئەرکەکەی‌و دکتۆرە (ر.ج)ی کرد بە پێدانی (١٥٠٠٠٠٠) دینار وەك قەرەبووی ئەو زیانانەی بەر داواکار کەوتووە بە هۆی کەمتەرخەمی پزیشکی ناوبراو لەسەرەوەو وریانەبونی پێویست لەکاتی بوونی داواکار لە نەخۆشخانە، کە بوو بەهۆی هەوکردنێکی توندی منالّدانی لە ئەنجامی لابردنی منالّدان‌و هێلکەدانی، کە بووە بە هۆی پیربونی پێشوەختی، لەکاتێکدا لەسەرەتای تەمەنیدایە.

قەرەبوکردنەوە بەرامبەر (دراو) هەموو ئەو خەسارەتانە دەگرێتەوە کە نەخۆش کردویەتی وەك: خەرجی چارەسەرکردن‌و مانەوە لە نەخۆشخانەو سەردانی کلینیك، لە ماددەی (١/٢٠٧)ی یاسای شارستانیدا دەڵێ: ( لە هەموو دۆخەکاندا دادگا بڕی قەرەبوو دەخەمڵێنێ بە ئەندازەی ئەو زیانانەی بەری کەوتووەو، بڕی ئەو دەسکەوتەی لە کیسی چووە، بە مەرجێك ئەو زیانە ئەنجامی سروشتی کارێکی ناڕەوابێت).

دادگای پێداچونەوەی عێراقی لە بڕیاری ژمارە ٥٨١/مدنیە اولی/١٩٧٨ لە ١٩٧٨/٧/٢٥ لەسەر هەمان شت ڕۆشتووە، ( قەرەبوکردنەوەی کردارێکی زیانبەخش ئەوەندەی زیان لێکەوتنەکەو ئەو دەسهاتەی (کسب) دەگرێتەوە لە ئەنجامی کارێکی ناڕەوا لەدەستی چووە). [١١٤]

**پێنجەم: سەرچاوەکانی قەرەبوکردنەوەو شایستەبوونی:**

**١ – قەرەبوکردنەوەی دادوەری:**

پێشتر وتمان ڕێسای گشتی قەرەبوکردنەوەی زیان دەخوازێت بڕی قەرەبوەکە هێندەی زیانەکە بێت، ئەوەش بۆ گێڕانەوەی هاوسەنگی بۆ ئەو بارە تێکچووە، سەرەڕای ئەوەی دەبێت زیانەکە ئەنجامی ڕاستەوخۆی هەڵە بێت، لە بنەڕەتدا ئەو قەرەبوەی شایستەی نەخۆشە دەبێت لەڕێی دادگاوە بێت، دادوەر دەستەڵاتی ئەوەی هەیە بگەڕێت بە شوێن ڕاستیەکانداو، بڕی زیانەکە بزانێت‌و، لەڕێی قەرەبوکردنەوە سارێژی زیانەکە بکات. قەرەبوو هەموو ئەو خەرجیانە دەگرێتەوە نەخۆش کردویەتی وەك: کرێی نەخۆشخانەو پزیشك‌و نەشتەرگەری‌و کڕینی دەرمان‌و هەموو ئەو دەسهاتەی بە هۆی ئەو زیانەوە لەدەستی داوە، ماددەی (١/١٦٩) دەڵێ: ( ئەگەر بڕی قەرەبوکردنەوە لە گرێبەستدا یان لە دەقێکی یاسادا دیاری نەکرابوو دادگا دیاری دەکات). لە ماددەی (١/٢٠٧) یاسای

شارستانیدا ئەوەی پەیوەندی بە درێخی کردنەوە هەیە هاتووە: ( لە هەموو دۆخەکاندا دادگا قەرەبوکردنەوە دەخەملێنیێ بە ئەندازەی بڕی زیانەکەو ئەو دەسهاتەی لە کیسی چووە، بەمەرجێك ئەو زیانە ئەنجامی سروشتی ئەو کارە ناڕەوا بێت). دادگای پێداچونەوەی عێراقی لە بڕیاری ژمارە ٣٨١ /تێهەڵچونەوە/ ١٩٦٩، لە بەرواری ١٩٧٠/٥/١٨، ڕونیکردەوە بەهای زیانەکان پرسێکی ڕوداوەکانەو، دادگای بابەتەکە بەپێی ئەو دەستەڵاتی خەمڵاندنەی هەیەتی خۆی سەربەخۆو سەرپشکە تیایدا. (١١٥). لە بەرپرسیارێتی پزیشکیدا زیان لەوە زیاترە لە دەقی ماددەی (٢٠٧)دا هاتووەو، لەم بەرپرسیاریەدا خەمڵاندنی قەرەبوو تایبەتمەندی خۆی هەیەو، هەموو ئەو تەنگژەو ئازارە جەستەیی‌و دەروونی یە دەگرێتەوە کە لە هەڵەی پزیشکیەوە دروست دەبێت. وەك دروستبونی ناتەواوی لە جەستەداو ناشیرینی لە ڕوواڵەتدا. ئەگەر دۆخی تەندروستی زیان لێکەوتووەکە لە گۆڕڕاندابوو، دادوەر نەیدەتوانی بڕی قەرەبوەکە دیاری بکات، زیان لێکەوتوو دەتوانێ لە ماوەیەکی گونجاودا داوای پێداچوونەوەی بڕی قەرەبوەکە بکات. ماددەی (٢٠٨)ی یاسای شارستانی دەڵێ: ( ئەگەر دادگا بۆی نەگونجا بڕی قەرەبوو بەتەواوی دیاری بکات مافی خۆیەتی بوار بدات بە زیان لێکەوتوو لە ماوەیەکی گونجاودا داوابکات جارێکی دیکە چاو بخشێنرێتەوە بە بڕی قەرەبوەکەدا). مردنی نەخۆشەکەش ماف دەدات بە کەسوکاری داوای قەرەبوی زیانی مەعنەویش بکەن، بەڵام دەبێت ئەوە بزانرێت قەرەبوکردنەوە لە زیانی مەعنەویدا پەیوەندی بە کەسی زیان لێکەوتوو هەیەو، نایەتە بوون تا کەسی بەرپرس ددانی پێدا نەنێت، یان زیان لێکەوتوو لە ڕێی دادگاوە داوای نەکات، قەرەبوکردنەوەی زیانی مەعنەوی ڕازیکردنی زیان لێکەوتووە بە هەر شتێك فشاری دەروونی زیان لێکەوتوو سوك بکات. (١١٦).

**ڕێگاکانی خەمڵاندنی بڕی قەرەبوو:**

دادوەر بە دوو ڕێگا بڕی قەرەبوو دەخەملێنێ:

یەکەمیان: دادگا بە شێوەیەکی گشتگیر بڕی قەرەبوو دەخەملێنێ، بە شێوەیەك هەموو زیانەکان پێکەوە دەخاتە ڕوو بەبێ جیاوازیکردن لە نێوان زیانی ماددی‌و مەعنەوی، بڕی قەرەبوکردنەوەکە بەرامبەر هەموو زیانەکان دیاری دەکات، شایانی باسە ئەم شێوە خەمڵاندنە جۆرێ هەڕەمەکی تێدایە.

دووەمیان: دادگا بە شێوەیەکی ورد لە زیانەکان دەکۆڵێتەوەو بڕیاری لەسەر دەدات، ئەم شێوازە زۆرتر گونجاوە لەگەڵ دادگەریدا، چونکە بڕی قەرەبوکردنەوەکەو، بڕی زیانەکە بە وردیو یەکسان دیاری دەکات، بە تایبەت لە زیانی هەڵەی پزیشکیدا بۆ هەر قۆناغێکی نەخۆشیەکە بڕیاری تایبەت دەدات.[117]

## ٢ - قەرەبوکردنەوە بە ڕێکەوتن:

ئەگەرچی لە بنەڕەتدا قەرەبوکردنەوە لە ڕێی دادگاوەیە، بەڵام هیچ ڕێگریەك نییە قەرەبوکردنەوە لەسەر ڕێکەوتن بێت، واتە پێشوەخت ڕێکەون لەسەر بڕی قەرەبوەکە، ئەگەر هەرکەسێکیان پێشێلی پابەندبونەکەی کرد بڕێکی دیاریکراو پارە بداتو، بڕەکەش لە گرێبەستەکەدا دیاری بکرێت، بەمەش دەوترێ: مەرجی سزایی.

ئەگەر پزیشكو نەخۆش ڕێکەوتن نەشتەرگەری بۆ بکرێتو، پزیشکەکە دوای بخاتو، پابەندبونەکەی جێبەجێ نەکاتو، فاکتەری کاتیش گرنگی هەبێت لەسەر نەخۆشەکەو، لە ئەنجامی ئەو دواخستنەش زیانی پێگەشت دەبێت، قەرەبو بکرێتەوە، بەڵام لە هەندێك کاتدا بڕی قەرەبوکردنەوەکە زۆرە، داوەر مافی ئەوەی هەیە کەمی بکاتەوە، بە شێوەیەك هاوتاو یەکسانی ئەو زیانەبێت لە نەخۆش کەوتووە، ماددەی (٢/١٧٠)ی یاسای شارستانی ئاماژەی پێ کردوەو دەڵێ: ( قەرەبوکردنەوە شایستە نابێت ئەگەر قەرزار سەلماندی خاوەن قەرز هیچ زیانێکی پێ نەگەشتووەو، سەلماندیشی بڕی قەرەبوەکە زۆرەو بەشێك لە پابەندبونە بنەڕەتیەکە جێبەجێ کراوە، هەموو ڕێکەوتنێك پێچەوانەی حوکمەکانی ئەم بڕگە بوو پوچ و بەتاڵە).

## ٣ - شایستەبونی قەرەبوکردنەوە:

هەموو داوایەك شارستانی یان سزایی بێت دەبێت لە دوو لایەن پێکهاتبێت کە داواکار و داوا لەسەر کراون، بابەتی داوای شارستانی پەیوەندی بە دەستەبەرکردن (زەمانەتکردن) و قەرەبوو کردنەوە هەیە، زیانلێکەوتوو بۆ سارێژکردنی ئەو زیانانەی لێیکەوتوە داوای دەکات، ئەوەی لێرەدا جێی بایەخە زیانلێکەوتووە، چونکە شایستەی قەرەبوکردنەوەیە لەو هەڵە پزیشکیانەی بەرامبەری کراوە، نەخۆشی زیانلێکەوتوو قەرەبوو دەکرێتەوە لەو زیانە ماددیانەی لەئەنجامی هەڵەی پزیشکی ڕوویانداوە، زیانی ماددیش هەر پێشێلکاریەکە بەرامبەر مافی زیانلێکەوتوو کراوەو بەهاو نرخی ماددی هەبێت یان

بەرژەوەندیەکی ڕەوا بێت. لە هەردوو بارەکەدا ئەو خەسارەتە دەگرێتەوە کە لێی کەوتووەو ئەو دەسهاتەیش کە لە دەستی چووە، هەموو زیانگەیاندنێك بە جەستە زیانی ماددیە، لەهەمانکاتدا قەرەبووکردنەوە زیانی مەعنەویش دەگرێتەوە کە هەستو سۆزو ناموسو ئازاری دەرونیو پێگەی کۆمەڵایەتیو خێزانیو سیاسی مرۆڤ دەگرێتەوە. (١١٨).

لە ماددەی (٢٠٥/ ١)ی یاسای شارستانی عێراقیدا ئاماژەی بۆ زیانی مەعنەوی کردووەو دادگای پێداچونەوەی فیدراڵی لە بڕیاری ژمارە ١٢٩/م٣/٢٠٠٤ لە ٢٠٠٤/٤/٣٠ دەڵێ: ( داواکارو ناکامەکان شایستەی ئەو قەرەبووکردنەوە نین کە شارەزایان خەملاندوویانە، تەنیا بڕی قەرەبووە ماددیەکە نەبێت، بە بێ قەرەبووی مەعنەوی چونکە ئەو زیانەی ئەوان داوایان کردووە بەر میرات بەجێهێڵەکە کەوتووەو، مافی داواکردنی قەرەبووکردنەوە بەپێی مەددەی (٢٠٥)ی یاسای شارستانی تەنیا زیانی ماددی دەگرێتەوە نەك زیانی مەعنەوی).

سەرنج دەدەین کۆمەڵێك خەڵك هەن ناڕاستەوخۆ زیانیان پێگەشتووەو، مافی دەستکەوتنی قەرەبوکردنەوەی ئەو زیانانەیان هەیە کەلێیان کەوتووە، مافەکەشیان ئەسڵیو بنەڕەتیەو لە نەخۆشەکەیانەوە بە میراتی بۆیان نەگەڕاوەتەوە. ئەو هاوسەرەی پزیشکێك بە هەڵەی پزیشکی زیانی گەیاندووە بە هاوسەرەکەی، یان ئەو مندالأنەی بەخێوکەرەکەیان نەماوە زیانی ڕاستەوخۆیان پێگەشتووە کە پێی دەوترێت زیانی (مرتد) گەڕاوە.واتە زیانەکە بەر کەسێك کەوتووە، پێچەوانەبووەتەوەو ڕاستەوخۆ بەری ئەمیش کەوتووە، وەك منداڵێك باوکی مردوە، بە لەدەستدانی بەخێوکەرەکەی ئەمیش زیانی لێکەوتووە.

خوای مەزن پشتو پەنای هەموانە ....

## ژێدەر:

١ - د. عبدالمجيد الحكيم، ود. عبدالباقي البكري، ود. محمد طه البشير، الوجيز في نظرية الالتزام في القانون المدني العراقي،

الجزء الاول، مصادر الالتزام، شركة العاتك لصناعة الكتاب، القاهرة، ٢٠١٠،، الطبعة الرابعة،، ص١٦.

٢ – المصدر نفسه، ص٤.

٣ – وائل تيسير محمد عساف، المسؤلية المدنية للطبيب دراسة مقارنة، جامعة النجاح الوطنية، نابلس ٢٠٠٨، ص٤٠.

٤ - د. ابراهيم احمد محمد الرواشدة، المسؤولية المدنية لطبيب التخدير دراسة مقارنة، دارالكتب القانونية للنشر، مصر،٢٠١٠، الطبعة الاولى. ص٩٩.

٥ – فيصل أياد فرج الله، سابقاً، ص٤٩.

٦ – وائل تيسير محمد عساف، سابقاً، ص٤٠-٤١.

٧ – فريحة كمال، المسئولية المدنية للطبيب جامعة مولود معمري تيزي وزو، تاريخ المناقشة ٢٠١٢/٩/٣٠، ص١٢٣-١٢٤.

٨ – د. منذر الفضل، المسؤولية الطبية، دار ئاراس للطباعة والنشر، اربيل، الطبعة الاولى، ٢٠٠٥، ص٧٤.

٩ - د. رمزي رشاد عبدالرحمن الشيخ، سابقاً، ص١١٦-١١٧.

١٠ – وائل تيسير محمد عساف، سابقاً، ص٤٤.

١١ – د. محمد جلال حسن الأتروشي، سابقاً، ص١١٥.

١٢ – شارف رحمة، المسؤولية الادارية عن الاخطاء الطبية، جامعة محمد خيضر بسكرة، الجزائر، سنة المناقشة ٢٠١٤، ص٤٤.

١٣ – سايكي وزنة، سابقاً، ص٨٠.

١٤ – فريحة كمال، سابقاً، ص١٤٢.

١٥ – د. ابراهيم احمد محمد الرواشدة، سابقاً، ص١٢٧.

١٦ – زياد خالد يوسف المفرجي، سابقاً، ص١٢٨-١٢٩.

١٧ – د. أنور يوسف حسين، ركن الخطأ فة المسئولية المدنية للطبيب دراسة مقارنة، دارالفكر والقانون للنشر، المنصورة، مصر، ٢٠١٤، الطبعة الاولى، ص٤٢٢.

١٨ – فريحة كمال، سابقاً، ص١٤٥.

١٩ – عبدالصبور عبدالقوى على مصرى، سابقاً، ص٢٣٢.

٢٠ – شريف الطباخ، سابقاً، ص٢٥٢.

٢١ – فريحة كمال، سابقاً، ص١٤٦.

٢٢ – زياد خالد يوسف المفرجى، سابقاً، ١٤٥.

٢٣ – سايكى وزنة، سابقاً، ص٨١-٨٢.

٢٤ – د. انور يوسف حسين، سابقاً، ص٥٠٦.

٢٥ - د. ابراهيم احمد محمد الرواشدة، سابقاً، ص٢١٤-٢١٥.

٢٦ - د. ابراهيم احمد محمد الرواشدة، سابقاً، ص١٢٨-١٢٩، وائل تيسير، سسابقاً، ص٥٧.

٢٧ – عباس على محمد الحسينى، سابقاً، ص٤٢-٤٣.

٢٨ – المصدر نفسه، ص٤٨.

٢٩ – المصدر نفسه، ص٤٨-٦٠.

٣٠ – سايكى وزنة، سابقاً، ص٨٠.

٣١ – وائل تيسير محمد عساف، سابقاً، ص٥٣.

٣٢ – شريف الطباخ، سابقاً، ص٧٧.

٣٣ - د. ابراهيم احمد محمد الرواشدة، سابقاً، ١٣٠-١٣١.

٣٤ - د. ابراهيم احمد محمد الرواشدة، سابقاً، ص١٢٧، وائل تيسير، سابقاً، ص٥٦.

٣٥ - د. ابراهيم احمد محمد الرواشدة، سابقاً، ص١٣٤-١٤٠.

٣٦– د. منذر الفضل، سابقاً، ص٥٢.

٣٧- د. منصور عمر المعايطة، المسؤولية المدنية والجنائية في الاخطاء الطبية، جامعة نايف العربية للعلوم الامنية، الرياض، الطبعة الاولى، ٢٠٠٤، ص٨١-٨٢.

٣٨ – سايكي وزنة، سابقاً، ص٨٤..

٣٩- وائل تيسير محمد عساف، سابقاً، ص٤٦.

٤٠ – د. منذر الفضل، سابقاً، ص٧٤-٧٥.

٤١ – د. عبدالمجيد الحكيم، ود. عبدالباقي البكري، ود. محمد طه البشير، الوجيز في نظرية الالتزام في القانون المدني العراقي،

الجزء الاول، مصادر الالتزام، شركة العاتك لصناعة الكتاب، القاهرة، ٢٠١٠،، الطبعة الرابعة، ص١٩٨.

٤٢ - نائل محمد يحيى، المسئولية الجنائية عن خطأ التأديب والتطبيب دراسة فقهية مقارنة، جامعة الازهر، غزة، فلسطين، سنة التخرج ٢٠١٢، ص٣٣-٣٤.

٤٣ – نائل محمد يحيى، سابقاً، ص٣٧.

٤٤ - د. علي حسين الخلف، د. سلطان عبدالقادر الشاوي، المبادئ العامة في قانون العقوبات، الناشر العاتك لصناعة الكتاب، القاهرة، الطبعة الثانية، ٢٠١٠، ص١٣٤.

٤٥ – المصدر نفسه، ص٣٠.

٤٦ - غضبان نبيلة، المسؤولية الجنائية للطبيب، جامعة مولود معمري – تيزي وزو، سنة المناقشة ٢٠٠٩، ص٧٦-٧٧.

٤٧ – د. علي حسين الخلف، د. سلطان عبدالقادر الشاوي، المبادئ العامة في قانون العقوبات،، الناشر العاتك لصناعة الكتاب، القاهرة، الطبعة الثانية، ٢٠١٠، ص٣٥١.

٤٨ – د. نشأت أحمد نصيف، شرح قانون العقوبات القسم الخاص، مكتبة السنهوري، بغداد، ٢٠١٠ ، ص٨٦.

٤٩ – د. ماهر عبد شويش الدّرة، شرح قانون العقوبات القسم الخاص، الناشر العاتك لصناعة الكتاب، طبعة ثانية بدون سنة الطبع، ص٢٠٨.

٥٠ – د. محمد سعيد نمور، شرح قانون العقوبات القسم الخاص، دار الثقافة للنشر والتوزيع، عمان، الاردن، الطبعة الاولى، ٢٠٠٨، ص١٥٥.

٥١ – د. طه عثمان ابوبكر المغربي، سابقاً، ص١٦٨.

٥٢ - د. ماهر عبد شويش الدّرة، سابقاً، ص٢٠٨.

٥٣ – د. على حسين الخلف، د. سلطان عبدالقادر الشاوى، ص٣٥٢.

٥٤ - د. طه عثمان ابوبكر المغربى، سابقاً، ص١٦٩.

٥٥ - د. ماهر عبد شويش الدّرة، سابقاً، ص٢٠٨.

٥٦ - د. طه عثمان ابوبكر المغربى، سابقاً، ص١٦٩.

٥٧ - د. نشأت أحمد نصيف، سابقاً، ص٨٧.

٥٨ - د. محمد سعيد نمور، سابقاً، ص١٦٠.

٥٩ - د. طه عثمان ابوبكر المغربى، سابقاً، ص١٧٢.

٦٠ - زياد خالد يوسف المفرجى، ص١٣٩.

٦١ – المصدر نفسه، ١٤٠.

٦٢ – د. ماهر عبد شويش الدرة، سابقاً، ص٢١٥.

٦٣ – د. محمد سعيد نمور، سابقاً، ص١٧٧.

٦٤ – طه عثمان ابوبكر المغربى، سابقاً، ص٢١١.

٦٥ – المصدر نفسه، ص٢١٢.

٦٦ – المصدر نفسه، ص٢١٢.

٦٧ – نشأت احمد نصيف، سابقاً، ص٩٩.

٦٨ - فيصل إياد فرج الله، الخصوصية المهنية للطبيب فى القتل الرحيم، منشورات زين الحقوقية، بيروت، لبنان، ٢٠١٧، الطبعة الاولى، ص١٨.

٦٩ – د. منصور عمر المعايطة، سابقاً، ص٩٧.

٧٠ – المصدر نفسه، ص٩٨.

٧١ - د. محمود احمد طه، الاساليب الطبية المعاصرة وانعكاساتها على المسؤولية الجنائية للطبيب، دار الفكر والقانون، المنصورة، مصر، ٢٠١٥، الطبعة الاولى، ص٦٩-٧٠.

٧٢ – المصدر نفسه، ص٣٠.

٧٣ – المصدر نفسه، ص٣٦.

٧٤ – المصدر نفسه، ص٣٦-٣٩.

٧٥ – المصدر نفسه، ص٧١.

٧٦ – المصدر نفسه، ص١٢٤.

٧٧ – د. منصور عمر المعايطة، سابقاً، ص١٠١-١٠٢.

٧٨ – كمال حسن مجيد، پزيشكى دادى له خزمەتى ماف‌و دادپاريزيدا، كۆمپانياى سازيار، له بلاوكراوەكانى زانكۆى گەشەپيدانى مرۆيى، چاپى يەكەم، ٢٠١٦، ص٨٢.

٧٩ - د. جابر مهنا الحسيناوى، المجموعة الكاملة للتشريعات الصحية القوانين والانظمة والتعليمات، الناشر مؤسسة العراق للاعلام والثقافة العلمية، بغداد، الطبعة الاولى، ٢٠٠٩م، ص٧٥.

٨٠ – د. عبدالصبور عبدالقوى على مصرى، سابقاً، ص٢٥٣.

٨١ - د. منذر الفضل، المسؤولية الطبية، دار ئاراس للطباعة والنشر، اربيل، ٢٠٠٥، الطبعة الاولى، ص١٢٠.

٨٢ – د. جابر مهنا الحسيناوى، سابقاً، ص٢٤١-٢٤٢.

٨٣ - سعود بن عبدالله التميمى، تزويرالتقارير الطبية فى نظم دول مجلس التعاون الخليجى، جامعة نايف العربية للعلوم الامنية، الرياض، سنة المناقشة ٢٠١١، ص٣.

٨٤ – د. ماهر عبد شويش الدرة، سابقاً، ص٢٠.

٨٥ – سعود بن عبدالله التميمى، سابقاً، ص٩.

٨٦ – د. جابر مهنا الحسيناوى، سابقاً، ص٣٣٢.

٨٧ - د. نشأت أحمد نصيف، سابقاً، ص١٣١.

٨٨ - شارف رحمة، المسؤولية الادارية عن الاخطاء الطبية، جامعة محمد خيضر بسكرة، الجزائر، سنة المناقشة ٢٠١٣-٢٠١٤، ص١٣.

٨٩ – المصدر نفسه، ص١٣.

٩٠ - سايكى وزنة، إثبات الخطأ الطبى أمام القاضى المدنى، جامعة مولود معمرى ـ تيزى وزو، الجزائر، ٢٠١٠-٢٠١١، ص٤٠.

٩١ - عبدالصبور عبدالقوى على مصرى، جرائم الاطباء والمسؤولية الجنائية والمدنية بين الشريعة والقانون، دار العلوم، القاهرة، ٢٠١١، الطبعة الاولى، ص١٢٨.

٩٢ – سايكى وزنة، سابقاً، ص٤٣.

٩٣ - شريف الطباخ، جرائم الخطأ الطبى والتعويض عنها، دارالفكر والقانون للنشر، المنصورة، مصر، ٢٠١١، الطبعة الاولى، ص١٠٩.

٩٤ – د. مازن ليلو راضى، القانون الادارى، مطبعة جامعة دهوك، طبعة ثالثة، ٢٠١٠، ص٩٠.

٩٥ – د. أنور يوسف حسين، سابقاً، ص١٦٢.

٩٦ – المصدر نفسه، ص١٦٤.

٩٧ – سايكى وزنة، سابقاً، ص٤٣.

٩٨ – شريف الطباخ، سابقاً، ص١١١-١١٢.

٩٩ – عبدالصبور عبدالقوى على مصرى، سابقاً، ص١٣٥.

١٠٠ – شريف الطباخ، سابقاً ص١٠٧.

١٠١ - د. منصور عمر المعايطة، المسؤولية المدنية والجنائية فى الاخطاء الطبية، جامعة نايف العربية للعلوم الامنية مركز الدراسات والبحوث، الرياض، ٢٠٠٤، الطبعة الاولى، ص٣٧، عبدالرحمن بن صالح الطيار، المسؤولية المدنية عن خطأ الطبيب فى دول مجلس التعاون الخليجى، جامعة نايف العربية للعلوم الامنية، الرياض، سنة المناقشة ٢٠١٠. ص٣٣.

١٠٢ - د. رمزى رشاد عبدالرحمن الشيخ، المسئولية المدنية للطبيب عن عمليات نقل وزراعة الاعضاء، دار الجامعة الجديدة للنشر، مصر، ٢٠١٥، ص٨٧.

١٠٣ – د. منصور عمر المعايطة، سابقاً، ص٣٧.

١٠٤ - بدر محمد الزغيب، المسؤولية المدنية للطبيب عن الاخطاء الطبية فى مجال التلقيح الصناعى، جامعة الشرق الاوسط، عمان، الاردن، سنة المناقشة ٢٠١١، ص٣٤.

١٠٥ – عبدالرحمن بن صالح الطيار، سابقاً، ص٣٤.

١٠٦ – المصدر نفسه، ص٣٥-٣٦.

١٠٧ – المصدر نفسه، ص٣٦-٣٧.

١٠٨ – د. عبدالباقي البكري، د. عبدالمجيد الحكيم، د. محمد احمد طه، نظرية الالتزامات في القانون المدني العراقي، ص٢٤٦.

١٠٩ – د. سميرة حسين محيسن، المسئولية المدنية لادارة المستشفى عن الخطأ الطبي للعاملين فيها، سابقاً، ص٢٧٤،

١١٠ - د. عبدالباقي البكري، د. عبدالمجيد عبدالحكيم، د. محمد احمد طه، نظرية الالتزامات في القانون المدني العراقي، ص٢٤٤.

١١١ - د. سميرة حسين محيسن، المسئولية المدنية لادارة المستشفى عن الخطأ الطبي للعاملين فيها، سابقاً، ص٢٧٥.

١١٢ – المصدر نفسه، ص٢٧٦.

١١٣ - د. عبدالباقي البكري، د. عبدالمجيد عبدالحكيم، د. محمد احمد طه، نظرية الالتزامات في القانون المدني العراقي، ص٢٤٦.

١١٤ - د. سميرة حسين محيسن، المسئولية المدنية لادارة المستشفى عن الخطأ الطبي للعاملين فيها، سابقاً، ص٢٩٧-٢٩٨.

١١٥ – تاسؤس ناميق براخاس، المشار اليه سابقاً، ص١٩٠.

١١٦ – د. سميرة حسين محيسن، المشار اليه سابقاً، ص٢٠٥.

١١٧ – المصدر نفسه، ص٢٠٦-٢٠٧.

١١٨– المصدر نفسه، ص ٢١٨-٢١٩.

# ئەنجام

**له میانەی ئەم گەشتەماندا لەگەڵ بابەتی هەڵەی پزیشکدا گەشتینە ئەم ئەنجامانەی خوارەوە:**

**١ – پیشەی پزیشکیی نایابترین پیشەیە، چونکە پەیوەندی بە جەستەی مرۆڤەوە هەیە، بۆیە دەبێت پزیشك لە ڕەفتارو مامەڵەکردنی لەگەڵ نەخۆشدا پێشەنگ بێتو، بە سۆزو بەزەییەوە کارەکانی ئەنجام بدات.**

**٢ – لەوەتەی پیشەی پزیشکی دروست بووە هەڵەی پزیشکیش ڕویداوە، بۆیە هەزاران ساڵە یاساو ڕێسای تایبەت دانراوە، بۆ لێپێچینەوە لەو زیانانەی بە نەخۆش دەگات.**

**٣ – هەڵەی پزیشکیی دیاردەیەکی جیهانیەو، لە وڵاتە پێشکەوتووەکانی وەك بەریتانیاو ئەمریکاو یابانو ئیسرائیلدا بەربڵاوە، لە ئەمریکادا دوای نەخۆشیەکانی دڵو شێرپەنجە بە سێیەم هۆکاری مردن دادەنرێت. لە وڵاتەکانی ئەفریقاو ڕۆژهەڵاتدا ئاماری ورد نییە.**

**٤ – وەك ڕێسایەکی گشتی پزیشك پابەندە بە ڕەنجدانو بە تەنگەوەهاتنو. توانا بەخەرجدان بە شێوازێکی هونەری پێویست، نەك بە ئەنجام گەیاندنو، چاکبونەوەی نەخۆش. بەڵام پابەند نەبوون بە بنەما جێگیرەکان لە خۆیدا هەڵەی پزیشکی یەو، بەرپرسیارێتی دروست دەکات.**

**٥ – یاسای سزادان سزای هەموو دەستدرێژیەك دەدات کە بکرێتە سەر مافی پاراستنی جەستە، دەستدرێژیەکە بە ئەنقەست بێ، یان بەبێ قەست بێت.**

**٦ – بە هۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاو کاری پزیشکیی، هەندێك لە کارە پزیشکیەکان بواری گریمانە هەڵناگرێو، پابەندی پزیشك تیایاندا بە ئەنجام گەیاندنە، وەك: گواستنەوەی خوێنو، ئەنجامە تاقیگەییەکانو، بەنجکردنو، دەرمانو، نەشتەرگەری جوانکاری ...**

**٧ – بە شێوەیەکی گشتی زیان گەیاندن بناغەی قەرەبوو کردنەوەی زیانلێکەوتووە، ئەگەرچی هەڵەش ڕوینەدابێت.**

٨ – بەپێی ڕێسای پەیڕەوکارو پەیڕەولێکراو، نەخۆش بۆ وەرگرتنی قەرەبوی ئەو زیانەی لێی کەوتووە، دەتوانێت بگەڕێتەوە سەر وەزارەتی تەندروستیو، پزیشکەکەش.

## پێشنیار:

١ – یاسایەکی تایبەت بە بەرپرسیارێتیو پابەندی پزیشکو، کادیری بواری تەندروستی دەربکرێت، ئەرکو مافیانی تێدا دیاری بکرێت.

٢ – وەزارەتی تەندروستی گۆڤارێکی یاسایی _ پزیشکیی وەرزیی دەربکات، هۆشیاری هەردوو بوارەکە بگەیەنێت بە پزیشکانو یاساناسان بە تایبەتو، جەماوەر بە گشتی.

٣ – هەرکەس کارێکی پزیشکییو تەندروستی دەکاتو، پسپۆڕی ئەو نییە، توندگیری یاساییو کارگێڕی لەگەڵدا بکرێت.

٤ – وەزارەتی تەندروستی سایتێك دابنێ بۆ هۆشیار کردنەوەی جەماوەر لە ئەرکو مافی نەخۆشخانەو، ئەرکو مافی نەخۆش.

٥ – لە ڕێی وەزارەتەوە فۆرمێکی یەککگرتوو دابەش بکرێت، ڕەچاوی مافی نەخۆشو بەرپرسیارێتی پزیشکی تێدا کرابێت، بە جۆرێك لەگەڵ یاسادا گونجاو بێت.

# المصادر

١ – د. نشأت احمد نصيف، شرح قانون العقوبات القسم الخاص، شركة المؤسسةالحديثة للكتاب، بيروت، لبنان، ٢٠١٠، الطبعة الاولى.

٢ – د. محمد سعيد نمور، شرح قانون العقوبات القسم الخاص الجزء الاول، دار الثقافة للنشر، عمان، الاردن، ٢٠٠٨ الطبعة الثالثة.

٣ – د. ماهر عبد شويش الدرة، شرح قانون العقوبات القسم الخاص، الناشر العاتك لصناعة الكتاب، القاهرة، مصر، الطبعة الثانية، بدون سنة الطبع.

٤ – د. منذر الفضل، المسؤولية الطبية، دار ئاراس للطباعة والنشر، اربيل، ٢٠٠٥، الطبعة الاولى.

٥ – زياد خالد يوسف المفرجي، المسؤولية الادارية عن الاعمال الطبية دراسة مقارنة، منشورات زين الحقوقية، بيروت، لبنان، ٢٠١٦، الطبعة الاولى.

٦ – عبدالصبور عبدالقوى على مصرى، جرائم الاطباء والمسؤولية الجنائية والمدنية بين الشريعة والقانون، دار العلوم، القاهرة، ٢٠١١، الطبعة الاولى.

٧ – د. حسين عبدالصاحب الربيعى، جرائم الاعتداء على حق الانسان فى التكامل الجسدى (دراسة مقارنة)، شركة العاتك لصناعة الكتاب، القاهرة، ٢٠١١، الطبعة الاولى.

٨ – ئاسؤس نامق براخاس، قبول المخاطر الطبية واثره فى المسؤلية المدنية دراسة تحليلية مقارنة، دارالكتب القانونية، القاهرة، ٢٠١٣، الطبعة الولى.

٩ – د. أنور يوسف حسين، ركن الخطأ فى المسئولية المدنية للطبيب دراسة مقارنة، دار الفكر والقانون للنشر، المنصورة، مصر، ٢٠١٤، الطبعة الاولى.

١٠ – شريف الطباخ، جرائم الخطأ الطبى والتعويض عنها، دارالفكر والقانون للنشر، المنصورة، مصر، ٢٠١١، الطبعة الاولى.

١١ – لقمان فاروق حسن نانكلى، المسؤلية القانونية فى العمل الطبى دراسة مقارنة بين القانون والشريعة، منشورات زين الحقوقية، بيروت، لبنان، ٢٠١٣، الطبعة الاولى.

١٢ – د. سميرة شمسو، المسؤولية الطبية بين القانون والشريعة، الناشر دار العصماء، دمشق، ٢٠١٢، الطبعة الاولى.

١٣ – د. احمد سلمان شهيب، عقد العلاج الطبى دراسة مقارنة، منشورات زين الحقوقية، بيروت، لبنان، ٢٠١٢، الطبعة الاولى.

١٤ – د. محمود احمد طه، الاساليب الطبية المعاصرة وانعكاساتها على المسؤولية الجنائية للطبيب، دار الفكر والقانون، المنصورة، مصر، ٢٠١٥، الطبعة الاولى.

١٥ – د. ابراهيم احمد محمد الرواشدة، المسؤولية المدنية لطبيب التخدير دراسة مقارنة، دارالكتب القانونية للنشر، مصر،٢٠١٠، الطبعة الاولى.

١٦ – د. رمزى رشاد عبدالرحمن الشيخ، المسئولية المدنية للطبيب عن عمليات نقل وزراعة الاعضاء، دار الجامعة الجديدة للنشر، مصر، ٢٠١٥.

١٧ – د. طه عثمان ابوبكر المغربى، المسئولية الجنائية عن الاخطاء الطبية فى مجال التوليد، دار الفكر والقانون للنشر، المنصورة، مصر، ٢٠١٤، الطبعة الاولى.

١٨ – د. سميرة حسين محيسن، المسئولية المدنية لادارة المستشفى عن الخطأ الطبى للعاملين فيها دراسة مقارنة، دار الفكر والقانون للنشر، المنصورة، مصر، ٢٠١٦، الطبعة الاولى.

١٩ – سمير عبدالسميع الاودن، المسئولية القانونية للطبيب والمستشفى والصيدلى، الناشر منشأة المعارف، الاسكندرية، مصر، ٢٠١١، الطبعة الاولى.

٢٠ – عباس على محمد الحسينى، مسؤولية الصيدلى المدنية عن أخطائه المهنية دراسة مقارنة، دار الثقافة للنشر، ١٩٩٩، الطبعة الاولى.

٢١ – د. محمد جلال حسن الاتروشى، المسؤولية المدنية الناجمة عن عمليات نقل الدم دراسة مقارنة، دار الحامد للنشر والتوزيع، الاردن، ٢٠٠٧، الطبعة الاولى.

٢٢ – فيصل إياد فرج الله، التنظيم القانونى لطبيب التجميل فى المرفق الطبى العام، منشورات زين الحقوقية، بيروت، لبنان، ٢٠١٧، الطبعة الاولى.

٢٣ – فيصل إياد فرج الله، الخصوصية المهنية للطبيب في القتل الرحيم، منشورات زين الحقوقية، بيروت، لبنان، ٢٠١٧، الطبعة الاولى.

٢٤ – د. منصور عمر المعايطة، المسؤولية المدنية والجنائية في الاخطاء الطبية، جامعة نايف العربية للعلوم الامنية مركز الدراسات والبحوث، الرياض، ٢٠٠٤، الطبعة الاولى.

٢٥ – وائل تيسير محمد عساف، المسؤولية المدنية للطبيب دراسة مقارنة، جامعة النجاح الوطنية في نابلس، فلسطين، سنة المناقشة ٢٠٠٨.

٢٦ – شارف رحمة، المسؤولية الادارية عن الاخطاء الطبية، جامعة محمد خيضر بسكرة، الجزائر، سنة المناقشة ٢٠١٣-٢٠١٤.

٢٧ – سعود بن عبدالله التميمي، تزويرالتقارير الطبية في نظم دول مجلس التعاون الخليجي، جامعة نايف العربية للعلوم الامنية، الرياض، سنة المنناقشة ٢٠١١.

٢٨ – عبدالرحمن بن صالح الطيار، المسؤولية المدنية عن خطأ الطبيب في دول مجلس التعاون الخليجي، جامعة نايف العربية للعلوم الامنية، الرياض، سنة المناقشة ٢٠١٠.

٢٩ – غضبان نبيلة، المسؤولية الجنائية للطبيب، جامعة مولود معمري – تيزي وزو، سنة المناقشة ٢٠٠٩.

٣٠ – نائل محمد يحيى، المسئولية الجنائية عن خطأ التأديب والتطبيب دراسة فقهية مقارنة، جامعة الازهر، غزة، فلسطين، سنة التخرج ٢٠١٢.

٣١ – فريحة كمال، المسؤولية المدنية للطبيب، جامعة مولود معمري – تيزي وزو، الجزائر، سنة المناقشة ٢٠١٢.

٣٢ – عياشي كريمة، الضرر في المجال الطبي، جامعة مولود معمري – تيزي وزو، الجزائر، سنة المناقشة، ٢٠١١.

٣٣ – آيت مولود ذهبية، المسؤولية المدنية عن أخطاء الفريق الطبي، جامعة مولود معمري – تيزي وزو، الجزائر، سنة المناقشة ٢٠١١.

٣٤ – سايكى وزنة، إثبات الخطأ الطبى أمام القاضى المدنى، جامعة مولود معمرى ـ تيزى وزو، الجزائر، ٢٠١٠-٢٠١١.

٣٥ – بدر محمد الزغيب، المسؤولية المدنية للطبيب عن الاخطاء الطبيبة فى مجال التلقيح الصناعى، جامعة الشرق الاوسط، عمان، الاردن، سنة المناقشة ٢٠١١.

٣٦ – زين الدين احمد بن رجب الحنبلى، جامع العلوم والحكم، مكتبة الشرق الجديد، بغداد، مطبعة الوسام، بدون سنة طبع.

٣٧ – د. عبدالمجيد الحكيم، ود. عبدالباقى البكرى، ود. محمد طه البشير، الوجيز فى نظرية الالتزام فى القانون المدنى العراقى، الجزء الاول، مصادر الالتزام، شركة العاتك لصناعة الكتاب، القاهرة، ٢٠١٠،، الطبعة الرابعة.

٣٨ – د. جابر مهنا الحسيناوى، المجموعة الكاملة للتشريعات الصحية القوانين والانظمة والتعليمات، الناشر مؤسسة العراق للاعلام والثقافة العلمية، بغداد، الطبعة الاولى، ٢٠٠٩م.

٣٩ – د. على حسين الخلف، د. سلطان عبدالقادر الشاوى، المبادئ العامة فى قانون العقوبات، الناشر العاتك لصناعة الكتاب، القاهرة، الطبعة الثانية، ٢٠١٠م.

٤٠ - د. مازن ليلو راضى، القانون الادارى، مطبعة جامعة دهوك، طبعة ثالثة، ٢٠١٠.

٤١ – ابن قيم الجوزية، الطب النبوى، دارنوبليس للنشر والتوزيع، بيروت، طبعة اولى، سنة ٢٠٠٧.

٤٢ – المستشار منير رياض حنا، الطب الشرعى، دارالفكر الجامعى، الاسكندرية، مصر، الطبعة الاولى، سنة ٢٠١١.

**القوانين:**

١ – اعداد صباح صادق جعفر الانبارى، دستور جمهورية العراق ٢٠٠٥، المكتبة القانونية، بغداد، ٢٠٠٨.

٢ – مشروع دستور اقليم كوردستان – العراق، www. Perleman. org

٣ - القاضي سردار عزيز خوشناو، التشريعات العقابية في القوانين العراقية الجزء الاول، مطبعة منارة، اربيل، ٢٠١٠م.

٤ – اعداد القاضى سردار عزيز خؤشناو، قانون العقوبات العراقى رقم (١١١) لسنة ١٩٦٩ وتعديلاته النافذة فى اقليم كوردستان. مطبعة منارة، اربيل، ٢٠١٠.

٥ – اعداد القاضى نبيل عبدالرحمن حياوى، القانون المدنى – العراقى - رقم (٤٠) لسنة ١٩٥١ وتعديلاته. المكتبة القانونية، بغداد، ٢٠٠٩،

٦ – هيوا ابراهيم حيدرى، قانون الاثبات رقم (١٠٧) لسنة ١٩٧٩ وتعديلاته،مطبعة منارة، اربيل، طبعة ثالثة، ٢٠٠٩.

٧ – ذاكر خليل العلى، قانون الصحة العامة رقم (٨٩) لسنة ١٩٨١. مكتبة الجيل العربى، الموصل، طبعة ثانية، ٢٠٠٦.

٨ – قانون مزاولة مهنة الصيدلية، رقم (٤٠) لسنة ١٩٧٠، نشر فى الوقائع العراقية عدد (١٨٥٤)، فى ١٩/٧/١٩٧٠.

٩ – قانون عمليات زرع الاعضاء الشرية رقم (٨٥) لسنة ١٩٨٦، نشر فى الوقائع العراقية عدد (٣١١٥)، فى ١٥/٩/ ١٩٨٦.

١٠ – قانون نقابة الصيادلة رقم (١١٢) لسنة ١٩٦٦، نشر فى الوقائع العراقية (١٣٥٨) فى ١/١٠ ١٩٦٧.

١١ – قانون نقابة الاطباء رقم (٨١) لسنة ١٩٨٤، نشر فى الوقائع العراقية عدد (٣٠١٣)، فى ١/١٠ /١٩٨٤.

١٢ – قانون نقابة اطباء الاسنان رقم (٤٦) لسنة ١٩٨٧، نشر فى الوقائع العراقية عدد (٣١٥٣)، فى ٨/٦/ ١٩٨٧.

١٣ – القاضى نبيل عبدالرحمن الحياوى، قانون اصول المحاكمات الجزائية رقم (٢٣) لسنة ١٩٧١ وتعديلاته، المطبعة القانونية، بغداد، ٢٠٠٣–٢٠٠٥.

Httpe/www.adelamer.com - 1

# پێڕستی بابەتەکان



**كمال حسن مجيد**

ساڵی لە دایکبوون/ ١٩٦٦

بڕوانامە:

بەکالۆریۆس لە یاسادا، زانکۆی گەشەپێدانی مرۆیی، سلێمانی، ٢٠١٢- ٢٠١٣.

بەکالۆریۆس لە شەریعەتدا، كليه المعرفه للدراسات الاسلاميه والعربيه، ٢٠٠٦-٢٠٠٧.

فوق دیبلۆم لە تەکنیکی تاقیگەدا، دانشگاه علوم پزشکی تهران، ١٣٦٧٧ ە. ش.

دیبلۆم لە شیکاری نەخۆشیدا. پەیمانگای تەندروستی هونەری، موصل، ١٩٨٥-١٩٨٦.

**بەرهەمە چاپکراوەکانی:**

١ - زیرەکی عاتیفی (وەرگێڕان)

٢ - سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکاو کاریگەری ئینجیلیەکان لە ئاراستەکردنیدا (وەرگێڕان)

٣ - زیرەکیی عاتیفیو بەختەوەری خێزان (وەرگێڕان)

٤ - پزیشکیی دادی لە خزمەتی مافو دادپارێزیدا (نوسین)

٥ - هەڵەی پزیشکو بەرپرسیارێتی یاسایی (نوسین)

ژمارەی مۆبایل: ٠٧٥٠١٣٤٩٣٧٣ - ٠٧٧٠١٣٠٩٣٠٧

==========================